# وتاری ئاینی

## بۆ رۆژانی هەینی

دانراوی

مەلا عبدالكريمی مدرس

ماموستای خوێندنگای ئایینی‌ی
شێخ عبدالقادری گەیلانی

وە

پێش نوێژو خوتبەخوێنی
مزگەوتی ئەحمەدی
لە بەغدا

دار المثنى للطباعة والنشر ببغداد

تلفون ٨٨٨٩٤٩٧

# وتاری ئایینی

## بۆ ڕۆژانی هەینی

دانراوی

## مەلا عبدالکریمی مدرس

ماموستای خوێندنگای ئایینیی
شیخ عبدالقادری گەیلانی

وە

پیش نوێژو خوتبەخوێنی
مزگەوتی ئەحمەدی
لە بغدا

دار المثنى للطباعة والنشر ببغداد
تلفون ٨٨٨٩٤٩٧

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**الحمد لله الذي جعل الايمان نورا في حقيقة الانسان ، وارشده به الى طريقة الخير والاحسان . والصلوة والسلام على سيدنا محمد المبعوث بالامان ، وعلى آله وصحبه واتباعه الى اخر الزمان .**

له پاش سوپاس بو خوای عالەم و ستایشی سەرداری ئەکردم حەزرەتی محمد ( صلى الله عليه وسلم ) ، بزانن ، لە سەر دەستووری قورئانی پیروز ، پیویستە هەمیشە کومەلی لە موسلمانان ئادابی ئایینی ئیسلام فیربن ، بو ئەوەی بینەوە بو لای گەلی هاوزمانی خویان و ئاموژگاری یان بکەن ، بو ئەوەی خویان بپاریزن لە هەر شتی کە خوای گەورە حەزی پی ناکاو ، خویان برازیننەوە بەو بیرو رەفتارو رەووشتە ، کە فەرمانی داوە بەجی ی بینن و ، لە ژیانی براوەی ئەم دنیاداو ، لە ژیانی نەبراوەی پاشەروژا ، بە سەربەرزی رابوبرن ..

وە لەبەرئەوەی کە هەر شوینی نویژی جومعەی تیا بکری فەرزە پیشەواکان بە دوو خوتبە ئاموژگاری کومەلەکەیان بکەن و ، لە کتیبە شەرعەکانا ، بەتایبەتی لە حاشیەی ( شیروانی )دا ئە فەرمویت : دروستە خەتیب لەگەل خوتبەکانا ئاموژگاری ی گەلەکەی بکات بە زمانی خویان ، هاتم ، شان بەشانی خوتبەی حەفتانەی هەموو روژیکی جومعە ، وتاریکی دینیم لەسەر شیوەی خوتبەی ئەو روژە نووسی ، هەتا خەتیب لە پیش خوتبەکانا بیخوینیتەوە بەسەر گەلەکەیاو ، عەقیدەو رەفتارو خوو و رەوشتی پیغەمبەریان نیشان بداو ، بو بەرزی ی دین و دنیایان ، پیش چاویان رووناك بکاتەوە .

هیوام وایە خوای میهرەبان ئەم کردەوەمە لی قەبوول بکاو ، بیکا بە هوی سوودو قازانجی دنیاو قیامەت بو موسلمانانی کورد .

# خوتبه‌كانی مانگی موحه‌ڕه‌م

## خوتبه‌ی یه‌كه‌م

**برا موسلمانه‌كانم !**

بزانن : خوای گه‌وره ، كه دنیای دروست كرد ، عه‌رزو ، ئاسمانی دروست كرد ، مانگ‌و روژو ئه‌ستیره‌ی به به‌رزه‌وه داناو ، شه‌وو روژو سال‌و مانگی هینایه به‌رچاو ، سالی به دوانزه مانگ بریاردا ، بو ئه‌وه‌ی كه ئادمی‌زاد ، به‌هوی نوی بونه‌وه‌ی مانگه‌وه ، له ئیش‌و كاری دنیادا، وه‌كو كشتوكال‌و مامه‌له‌و سه‌ندن‌و فروشتن‌و واده‌ی قـــه‌رز ، وه له‌ئیش‌وكاری دینا ، وه‌كو نویژو روژوو ، زه‌كات‌و حه‌ج ئاگاداربن •

وه له‌م دوانزه مانگه‌دا چوار مانگیانی زور به قه‌درو گـــه‌وره كردووه ، شه‌رو شورو هه‌رای تیا حه‌رام كردوون ، به‌تایبه‌تی لـــــه ولاتی (حجاز)ا ، كه شوینی (مه‌ككه‌)ی پیروزه ، بوئه‌وه‌ی كـــه موسلمانان به ئاسایش ئادابی حه‌ج به‌جی‌بهینن‌و ، ئیش‌و كـــــاری خویان راپـــه‌رینن •

ئه‌م مانگانه سیانیان وان به‌یه‌كه‌وه ( ذی القعدة ) ، ( ذی الحجة )، ( محرم ) ، وه یه‌كیكیان به‌جیایه كه بریتی‌یه له مانگی ( رجب ) •

روژی ده‌هه‌مینی مانگی ( ذی الحجه ) مانگی قوربان ، له‌گـــه‌ل سی روژی‌تری پاش‌ئه‌وی كردووه به كاتی به‌جی‌هینانی ئادابی ( حه‌ج‌و عه‌مره ) ، وه روژووی نو روژی ئه‌وه‌لی ئه‌م مانگه ، له ئایینی ئیسلاما، زور به‌نرخه ، به تایبه‌تی روژووی روژی نوهه‌م‌و ده‌هه‌می مانگی محرم سو ننه‌تیكی خاوه‌ن خیره‌و ، له‌لاینی حه‌زره‌ته‌وه ، دروودی خوای لی‌بی، فه‌رمان به روژووی ئه‌م روژانه دراوه •

هه‌روه‌ها سه‌ره‌تای مانگی محرم كراوه به سه‌ره‌تای میـــژووی ئیسلام ، له‌به‌رئه‌وه‌ی پیغه‌مبه‌ر ، دروودی خوای لی‌بی ، پاش ئه‌وه كه له ته‌مه‌نی چل‌سالیدا بوو به پیغه‌مه‌ری خوا ، بو سه‌ر هه‌موو جن‌و ئاده‌میزاد ، سیانزه سالی تر هه‌ر له شاری (مه‌ككه‌)دا مایه‌وه‌و گه‌یشته

پەنجاوسی،جا لای خواوە فەرمانی بوهات کە لە شاری مەککەوە کا بو شاری ( مەدینەی منورە ) ، وە لە مانگی محرمەوە کەوتە دەکردن ، هەتا لە مانگی ( ربیع الاول )دا کوچی کرد بو شاری : لەگەل ابو بکری صدیقا خوای لی رازی بی ، وە پاش ئەوە کو ، دوو دووو ، زیاتر ، ئەصحابەکان کوچیان کرد بو مەدنەو، ی حەزرەتا کوبوونەوە •••

یتر حەزرەت ، دروودي خوای لی بی ، لەو کاتە بە دواوە ، هیزی ، بە گەرم دەستی کرد بە راگەیاندنی فەرمانی خوای گەورە بە و ، پاناپی وولاتی حیجازو دەوروبەری لە تاریکی‌ی کوفـــرو ستی پاك کردەوە •• وە لە ماوەی دەسالی ئاخری ژیـــانی ی ، کە لە مەدینە راي‌بوارد ، نزیکەی شەستو سی جەنگی کرد ، کافرەکاناو ، لە نزیکەی بیست شەریانا خوی حازر بوو ، بەو ە دینی پیروزی ئیسلام لە ولانی حیجازو یەمەندا بلاو بووەوەو خوی گرتو بەهیز بوو •

لە روژی دووشەممەی سەرەتای مانگی ( ربیع الاول ) دا گیانی سپاردو کوچی دوایی کرد، وە لە ژوورەکەي حەزرەتی (عائشە)دا شتی مزگەوتەکەیەوە نیژرا •••

لە پاش ئەو ئەبوبەکری صدیق : خوای لی رازی بی ، کرا بـــە نشین‌و کاروباری ئیسلامی گرتە ئەستو ، دوو سال‌و شەش مانگ ەر خەلافەت مایەوە ، ئەنجا ئەویش کوچی دوایی کردو ، لە نزیکی رەتا لە هەمان ژووردا نیژرا ••

ئەمجار ، لەسەر راویژی ئەبوبەکر ، عومەری کوری خطاب ، خوای رازی بی ، کرا بە خەلیفەو ، موسلمانان بەیعەتیان پی‌کرد ، ئـــەم لیفە دادپەروەرە ، کە کاروباری ئیسلامی گرتە دەست ، ســـالی چ کردنی پیغەمەری ، لە مەککەوە بو مەدینە کرد بە سالی یەکەمی ووی ئیسلام •

پیویسته بزانن که پیغەمەرایەتی حەزرەتي محمد ، درووودي خوای لی بی ، بو گشت ئادەمیزادی ئەم سەرزەوی‌یەو ، بو هەموو جنە ، وە ئەم ئایینە پیروزە ، هەتا دنیا دنیایە ، پایەدار ئەبی‌و ، لەپاش پیغەمبەر ، درووودی خوای لی بی ، پیغەممەری‌تر نابی‌و ، دەستووری ئـــــینی ئیسلام بریتیە لە قورئانی پیروز ، کە لە ماوەی بیست‌و سی سالا خوا ناردوویەتی بو پیغەمەر ، درووودی خوای لی بی •

قورئان بریتیە لە شەش هەزارو شەش سەدو شەست‌و شـــــەش ئایەت‌و ، تەفسیرکردن‌و لیکدانەوەی مەعنای قورئان . بــــــــەهوی فەرموودەی حەزرەت‌و کردەوەیەوە ، دەرکەوتووە بو موسلمانان •

لە زەماني پیغەمبەرا، درووودی خوای لی‌بی، گەلیك لە هاوریکانی ( اصحاب ) قورئانیان لەبەر کردووەو ، فەرموودەکانی حەزرەتیشیان وەرگرتووە ، وە لەپاش وەفاتی ئەو رەفتاریان کردووە بە قورئان‌و بە فەرموودەی حەزرەت ، وە لە پاش ماوەیەك ، دوای زەمـــــانی چوار خەلیفەکان ، ئەبوبەکرو ، عومەرو ، عوسمان‌و ، عەلی ، خوایان لـــی رازی بی ، زانایانی ئیسلام دەسیان کرد بە نوسینەوەی فەرموودەکانی حەزرەت ، لە چەند لاوە زانای گەورە گەورە هەلکەوتن‌و ، ئایینی ئیسلامیان بەتەواوی نوسی‌و ، هەندیکیان خاوەنی پەیرەو(مەذهەب)ی تایبـــــەتی بوون •

مەذهەبی چوار کەس لەم ئیمامانە بەناو موسلمانی دنیادا بـــلاو بوەتەوە ، ئیمامی أعظم کە مەشهورە بە ئەبوحەنیفە ، ئیمامی مالیك ، ئیمامی شافعی ، ئیمامی ئەحمەد • وە ئەم مەذهەبانــە پەیرەوی ئەهلی سوونەت‌و جەماعەتەو،لەسەر شیوەی رەفتاری حەزرەت‌و ئەصحابەکانە، ئیمەی کورد زمان ، لەسەر پەیرەوی ئیمامی شافعین •

× × ×

الحمد لله ، ثم الحمد لله ، ما توفيقي ولا اعتصامي الا بالله . عليه توكلت ، واليه انيب ، الحمد لله الذي خلق السموات والارض وبث

فبعما الانام ، وقدر الزمان بالاعوام ، والاعوام بالشهور والايام ، وجعل عدة الشهور اثني عشر شهرا ، منها اربعة حرم بنص الكلام .

احمده واشهد ان لا اله الا الله ، وحده لا شريك له ، وان سيدنا محمدا عبده ورسوله ، سيد الانام .

اللهم صل وسلم على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه واتباعه البررة الكرام ، خصوصا على سادة ديننا ذوي القدر العلي والفخر الجلي ابي بكر وعمر وعثمان وعلي ، وعلى الحسن والحسين وحمزة والعباس، وعلى الستة الباقية من العشرة المبشرة ، رضوان الله تعالى عليهم اجمعين .

اوصيكم ، ايها الناس ! ونفسي ، اولا ، بتقوى الله وطاعته ، فان الله مع الذين اتقوا ، والذين هم محسنون .

ايها الاخوان ! ان شهركم هذا « محرم الحرام » ، وهو احد الاشهر الاربعة الحرم ذو القعدة ، وذو الحجة ، ومحرم ، ورجب الفرد . ومحرم هذا من الشهور المباركة ، وفيه نجى الله تعالى سيدنا موسى من فرعون ، وشرع صوم اليوم التاسع والعاشر منه ، بسنة سيد الانام ، وهو المبدأ للتاريخ الاسلامي ، والمفتتح للنصر وظهور فجر الاسلام على صفحات الايام ، وفيه استعد سيدنا محمد ( صلى الله عليه وسلم ) للهجرة من مكة المكرمة الى المدينة المنورة ، على ساكنها الصلاة والسلام ، فحري بالمؤمن ذكرى هذا المهاجر العظيم ، وتطبيق ما بلغه ، والاتصاف بما تخلق به من الخلق العظيم ، والسير على المنهج الذي عينه للمؤمنين .

قال ـ صلى الله عليه وسلم ـ : « المؤمن اخو المؤمن » ، « والمؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضا » . المؤمن من أمنه الناس على اموالهم وانفسهم ، والمهاجر من هاجر الخطايا والذنوب .

ان عدة الشهور عند الله اثنا عشر شهرا في كتاب الله يوم خلق السموات والارض ، منها اربعة حرم ، ذلك الدين القيم ، ولكن اكثر الناس لا يعلمون . نبهني الله واياكم من نومة الغافلين ، وحشرني واياكم تحت لواء سيد المرسلين .

× × ×

الحمد لله الحميد المجيد ، المحصي المبدىء المعيد ، قامع كل جبار عنيد ، الجليل الذي يفعل في خلقه ما يشاء ، ويحكم ما يريد .

احمده واشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ، وان سيدنا محمدا عبده ورسوله ، اللهم صل على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم تسليما .

أوصيكم ايها الناس ! ، ونفسي ، اولا ، بتقوى الله وطاعته ، فان الله مع الذين اتقوا ، والذين هم محسنون .

ايها المؤمنون ! عليكم باطاعة اوامر الله ، والاجتناب عما نهى عنه الله ، وعليكم بالصلوة والسلام على حبيبه الامين ، قال — عز من قائل — ان الله وملائكته يصلون على النبي ، يا ايها الذين آمنوا صلوا عليه وسلموا تسليما .

اللهم صل على سيدنا محمد سيد الانبياء الكرماء من اهل الزمان ، القائل : — الراحمون يرحمهم الرحمن ، يا ايها الذين آمنوا صلوا عليه وسلموا تسليما .

اللهم اغفر للمؤمنين والمؤمنات ، والمسلمين والمسلمات ، الاحياء منهم والاموات . اللهم انصر من نصر الدين ، واخذل من خذلنا وخذل المسلمين ، وايدنا على الحق برحمتك يا ارحم الراحمين .

عباد الله ! ان الله يأمر بالعدل والاحسان وايتاء ذي القربى ، وينهى عن الفحشاء والمنكر والبغي ، يعظكم لعلكم تذكرون ، ولذكر الله اكبر .

# خوتبەی دووهەم ، بۆ مانـــگی موحـــەڕەم

بە بونەی ئەم کاتەوە ، کە سەری سالی هیجری‌یەو ، کاتی یادی گەورەی سەربەرزی جیهانە ، درووددی خوای لی بی ، چەند کەلیمەیەك لە وتارە بەرزەکانی باس ئەکەین :

یەکی لەوانە ئەمەیە کە فەرموویەتی : « موسولمانی کە تیکەلی‌ی موسولمانان بکاو ، ئاموژگاری‌یان بکاو،ریگای رزگاری‌یان نیشان‌بداو، خوگر بی لەسەر ئازاری کە لەلایەنی ئەوانەوە تووشي ئەبی ، گەورەترە لای خوا لەوکەسەی کە تیکەلی خەلك ناکاو ، لەسەر ئازاری ئەوان سەبر ناکا » ..

یەکیکی‌تر لەو فەرموودانە ئەمەیە کـــە فەرموویـــەتی ئینسانی موسولمانی باش قەدری لای خوا بەرزترە لە هەندی فریشتە ( ملائکە ) ، چونکە ، ئەگەرچی فریشتە بی‌گوناهن‌و ، هەمیشە فـــەرمانی خوای گەورە بەجی‌ئەهینن ، بەلام ، لەبەرئەوەی ئادەمیزاد گیرودەی هـــەواو ئارەزووی نەفسەو ، لەبەر رەزای خوای خوی ، واز لـــە ئارەزووی نەفسي ئەهینی ، پایەی لای خوای گەورە بەرزترە لە پایەی هەنـــدی فریشـــتە .

یەکیکی‌تر لەوفەرموودانە ئەوەیە : موسولمانی باش ئەوەیە کـــە هەمیشە ببی بەهوی سوودو قازانجی موسولمانان ، لەگەلیا بروی بەریدا قازانجت پی‌بدا ، داوای راویژت لی‌کرد قازانجت پی‌بگەیینی‌و، بەهوی راویژی بەسوودەوە موسولمانان لە ئازار دوور بخاتەوەو ، لە خـــیرو ئاسایشی هەردوو دنیا نزیکیان بکاتەوە ، وە ئەگەر بووی بە شەریکی لە مامەلەو ئیش‌وکاری ژیانا قازانجت پی بدا ..

یەکی لەو فەرموودانە ئەوەیە فەرموویەتی موسولمانان ، بو یەکتر، وەکوو خشت‌و دارو بەردی دیواری خانوو وەهان ، کە هەندیکیان هەندیکی‌تریان توند ئەکاتەوە ، بەهەموویانەوە قەوارەی ئەو خـــانوە راگیر ئەکەن ، واتە : ئەبی هەمیشە موسولمانان هەست بکەن بەوەی

که له ژیانی دینو دنیای موسولمانان پرسیار لیکراونو، پپویسته ئاگادار بن له قازانجو زیانو خوشیو ناخوشی کومهلهکهیان و ، بـه ههموو جوری ههول بدهنو چاکهیان بو تهواو بکهنو ، خـراپهیان لی دور بخهنهوه ، وه ههرکامیان قازانجي زورتر بی بو موسولمانان ، ئهوهیان به چاکترو خیرومهندتر ئهناسری •

یهکیکیتر لهو فهرموودانه ئهوهیه : « موسولمان نهرمو ئارامه ، موسولمان دلو ناوچاو روناکه ، موسـولمان زیرهكو هوشیاره ، موسولمان براي موسولمانه ههرگیز واز له دلسوزی نایهنی لهگهلیاناو ، ئادهمیزادی له راستی لادهر پهستهو بیسوودهو ، قازانجي لی وهرناگیری ••

یهکیکیتر لهو فهرموودانه ئهوهیه : «ئهوکهسانهی لهسهر رهوشتي من ئهرون به ریدا . لهکاتیکا که ئومهنی من تووشی کهمو کووریی ئایین ئهبنو ، کردهوهیان لهسهر رهوشتی من نیه ، ئهوکهسه راسلانه ، ههرکاتی بمرن ، پایهی شههیدیان ههیهو ، لهلای خوای گهوره بـــه شههیــد ئهناسرین •

یهکیکیتر لهو فهرموودانه ئهوهیه : « زور ئارهزوومهندمو حهزم ئهکرد بگهشتمایه بهو برایانهم که ئیمانیان به من هیناوهو ، چـاویان نهکهوتوه پیم » •

واته : موسولمان . ههتا دوور بکهویتهوه له زهمانـی پیغهمبهر ، دروودی خو ی لی بی ، مادام لهسـهر رهفتاری موسولمانان دهوام بکـا ئهوه پایهی لای خوا بهرزتر ئهبی ، بهرادهیهك ، که حهزرهت ، دروودی خوای لی بی ، ئارهزوی ئهوهی کردوه چاوی بکهوی بــــهو جوره موســـــولمانانه •

ئهمه چهند قسهیهك بوون لهو فهرموودانه که پیغهمبهر ، دروودی خوای لی بی ، فهرموویهتیو، بو موسولمان ئهبنه چرای شهوی تاریكو، ئهبن بههوی ئهوه که بهرچاوی رووناك ببیتهوه له ههردوو دنیادا ، ههتا

ه ئاسایشی ئەبەدی ئەگات ...

× × ×

الحمد لله ، ثم الحمد لله . الحمد لله الذي هـــــدى الانسان الى الاحسان ، ونور طريقه الى السعادة بنور الايمان ، احمده واشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ، وان سيدنا محمدا عبده ورسوله الى الانس والجان . اللهم صل وسلم على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه والتابعين لهم باحسان ، خصوصا على سادة ديننا ذوي القدر العلي والفخر الجلي سيدنا ابي بكر وعمر وعثمان وعلي ، وعلى الحسن والحســين وحمزة والعباس وعلى الستة الباقية من العشرة المبشرة ، رضوان الله تعالى عليهم اجمعين .

اوصيكم ، ايها الناس ، ونفسي ، اولا ، بتقوى الله وطاعته ، فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون .

قال تعالى : « قل ان كنتم تحبون الله فاتبعوني يحببكم الله ويغفر لكم ذنوبكم ، والله غفور رحيم . ايها المؤمنون ! ان الرسول الاكرم صلى الله عليه وسلم ذكر في شأن المؤمن احاديث شريفة يجب عليكم ان تتبعوها لعلكم تفلحون .

فمنها انه قال : المؤمن الذي يخالط الناس ويصبر على أذاهم أفضل من المؤمن الذي لا يخالط الناس ولا يصبر على اذاهم . ومنها انه قال: المؤمن منفعة ، ان ماشيته نفعك ، وان شاورته نفعك ، وان شاركته نفعك، وكل شيء من أمره منفعة . ومنها انه قال : المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضا .

اعوذ بالله من الشيطان الرجيم ان في هذا لبلاغا لقوم عابدين ومـــا ارسلناك الا رحمة للعالمين . نبهني الله واياكم من نومة الغافلين ، وحشرني واياكم تحت لواء سيد المرسلين .

# کورتەی سێیەم بۆ مەتنەکەی موختەرەم

برا موسوڵمانەکان ! ئاینی ئیسلام دامەزراوە لەسەر پانزە بەند ، هەشت بەندیان بە بناغەی ئاینی ئەناسرێن و ، ئەوانە بریتین لە ئیمان و باوەڕ بە خواو بە فریشتەو ، بەو کتێبانە کە خوای گەورە ناردوونی بۆ سەر پێغەمبەرەکان، وە بە ڕۆژی قیامەت،وە باوەڕ بە قەزاو قەدەر.

هەروەها پێنج بەندیان بە فروعی دین ، وانە لقو پۆپی ئاینی ئیسلام ئەناسرێن و ، ئەوانە بریتین لە دوو کەلیمەی شەهادەت ، بەجۆری کە موسوڵمان ، لەگەڵ باوەڕی دڵا ، بە زمان بڵێت : أشهد ان لا الـه الا الله ، واشهد ان محمدا رسول الله ، وە لە پێنج فەرزەی نوێژ لە هەموو شەوو ڕۆژێکاو ، لە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان و ، لە زەکاتی ماڵو سەرو ، لە حەجی کەعبە ، یەکجار لە عومرا ، بۆ ئەوکەسەی دەستی بڕواو توانای بێ .

ئەی موسوڵمانینە ! ئیمان باوەرە بەوانەی وتمان و ئەبێ بە هۆی ڕزگاربوون لە سزای قیامەت و ، بە هۆی سەربەرزیو سەرفرازیو شادی لەوڕوژە ئەبراوەدا .

پێویستە بزانن ئیمان و باوەر بەخوا بریتیە لە باوەر بە ذاتی خواو سیفاتی خواو کردەوەو کارکردنی هێزی ئەو لە جیهانا ، یانی موسوڵمان پێویستە باوەڕی بێ بەوە کە خوای گەورە ( وجود )ی هەیە ،(قدیم)ە، هەربووە ، ( باقی )یە هەرئەمینی ، لە هیچ شتێک ناچێو ، بێ‌ئیحتیاجە لە هەمووشتێو ، تەنیایە ، زیندووە ، زانایە ، خاوەن (ارادە)و خواهشو خواستە ، خاوەن توانایەو ، بیناو شنەوایە ، ئەبینێو ئەبیسێو ، گوفتوگوی هەبوە ، وە گوفتوگوی لەگەڵ پێغەمبەرانا کردووە .

بەکورتی مەبەس لە ئیمان بەخوا ئەوەیە موسوڵمان پێویستە ئیمان و باوەڕی وابێ ئەم دونیایە ، بە ئەرزو ئاسمان و ، دەریاو و شتیو ، ئەستێرەو مانگ و ڕۆژو ، هەموو شتێکیترەوە چ دیار بێو چ پەنهان بێ ، هەمووی وا لە ژێر هێزی ئەو پەروەردگارەدا کە ناوی (خوا)یەو، ذاتێکە هەر بووەو هەر ئەبێو ، نەبوونی لێ پێش نەکەوتووەو ، نەبوونی

بەسەرا نایەت‌و ، وینەی هیچ‌شتیك نی‌یەو ، هەرچی بە خەیالی ئیمانـا
بیت ، خوای گەورە وا نیـەو ، ئیحتیـاجی بە هیـچ شتیـك یەو ،
هەموو‌شتیك موحتاجە بەوو، پیویستی بە خواستی خوا هەیە لە بوون‌و
نەبوونی خوی‌و ئەحوالی ، وە خوای گەورە تەنیایە ، واتە : هەرئەو
پیویستە بی‌و ، ئیتر هەرچی هەیە بیجگە ئـەو ، بوون‌و نەبوونی
وەکوو یەك وایە ، هەرئەو عیبادەت‌و ئیتاعەی ئەکری‌و بەندەیی هەربو
ئەو پیویستە بکری ، هەرئەو خالق‌و پەروەردگارە ، هەرچی لەم جیهانا
بووەو هەیەو ئەبی ، ئەو دروستی کردووەو ، دروستی ئەکات .

خوای گەورە زیندووە، بی‌پیویستی بە لەش‌و گیان‌و، هەرگیز‌نامری
زانایە بە هەموو شتیك ، تەنانەت ئەو وردە توزانەش ، کـە لەبەر
تیشکی روژا لە کونی دەلاقەدا دەرئەکەون ، لەبەر زانستی خوادا
دیارین،خاوەن (ارادە)و خواستە،واتە:هەر شتی هەبی ئەبی ئەوخواستی
لەسەر بوونی هەبی، وەهەرشتیك نەبیت خوای گەورە خواستی لەسەر
بوونی نیە ، خاوەن قودرەتە ، هەرچی قابیل‌و شایانی بوون‌و نەبوون‌بی
رامە بو هیزی دەسەلات‌و توانای خـوا ، وە خاوەن (سمع)ە وانـە :
هەموو دەنگی ئەبیسی ، تەنانەت ئەگەر میروولەیەك بـە ژیر رەوی‌دا
بروا ، دەنگی پی‌ی لای خوای گەورە ئاشکرایە ، وە خاوەن (بصر)ە
وانە : بینایەو هەموو شتی ئەبینی‌و ، گەورەو بچوك لای بینینـی‌خوا
یەك‌سانە ، وە خاوەن (کلام)ە ، واتە : صیفەتی کەلامی هەیەو ، قسەی
کردووە لەگەل پیغەمبەرانا ، چ بە بی‌هوی فریشتـە ، وەکـوو لەگەل
حەزرەتی موساداو ، چ بەهوی فریشتەوە ، وەکو گوفتوگوی لەگـەل
پیغەمبەرانی ترا ، لە ریگای ئەوکتیبانەوە کە ناردوویەتی بویان .

× × ×

الحمد لله ، ثم الحمد الله الذي لا اله الا هو الحي القيوم ، رب
السموات والارض وما بينهما ، ورب كل عين وعرض ومفهوم ..احمده
واشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ، وان سيدنا محمدا عبـده
ورسوله ، اللهم صل على سيدنا ومولانا محمد وعلى آله وصحبـــه
واتباعه بالاستقامة في كل محدود ومرسوم ، خصوصا على سادة دينا

دوى القدر العلى والفخر الجلى سيدنا ابى ابكر وعمر وعثمان وعلى ، وعلى الحسن والحسين وحمزه والعباس ، وعلى الستة الباقية من العشرة المبشرة رضوان الله تعالى عليهم اجمعين ••

اوصيكم ايها الناس ! ونفسى اولا بتقوى الله وطاعته ، فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون •

ايها المومنون ! سئل النبى ، (صلى الله عليه وسلم) ، عن الايمان، فقال : ـ الايمان ان تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله ، وباليوم الاخر ، وبالقدر ، خيره وشره ، وسئل عن الاسلام ، فقال : ـ الاسلام ان تشهد ان لااله الا الله ، وان محمدا رسول الله ، وتقيم الصلوة، وتوءتى الزكاة ، وتصوم رمضان ، وتحج البيت ، ان استطعت اليه سبيلا •

هذا الحديث الشريف اوضح لنا ان اصول الايمان ستة اركان ، وفروعه العملية خمسة اركان ، ويجب على كل مكلف ان يتحلى بحلية الايمان والاسلام ، ومن تخلى عن الايمان فقد خرج عن الدين، ومن تخلى عن الفروع العملية فقد خرج من جماعة المسلمين •

والايمان بالله هو الايمان بانه موجود واجب الوجود ، قديم ، ازلي وباق ، ابدى ، يخالف الحوادث باسرها، ويستغنى عن كل شيء ،والكل محتاج الى ذاته تعالى فى وجوده واحواله وافعاله شرها وخيرها ، وهو الواحد فى الخلق والعبادة ، ووجوب الوجود • وانه تعالى حي حياة ازلية ، وعليم علما ثابتا بالاعيان والاعراض ، والمفاهيم الخفية والجلية ، ومريد ارادة لايعارضها شيء ، وقادر قدرة لايخرج عن دائرتها ممكن، حتى الظل والفيىء ، سميع لكل مسموع سرا وجهرا ، بصير بكل شيء قابل لان يرى ، متكلم بكلامه الازلى مع الانبياء والمرسلين صلوات الله عليهم اجمعين •

اعوذ بالله من الشيطان الرجيم •

ان فى هذا لبلاغا لقوم عابدين ، ومارسلناك الا رحمة للعالمين •• نبهنى الله واياكم من نومة الغافلين ، وحشرنى واياكم تحت لواء سيد المرسلين •

## خوتبەی چوارەم بـــوعانـــــتی موتەرپەم

**برا موسولمانەکان !**

لە واجباتی موسولمانە کە باوەری وابی لە روژی قیامەتدا بـــە خزمەتی خوای گەورە ئەگاتو ، چاوی بە خوا ئەکەوی ، بەجوری کە گومانو دوودلی لەو دیتنەدا نابی ، خوای گـــەورە لە قورئانی پیروزا فەرموویەتی (وجوه یومئذ ناضرة ،الـی ربهـا ناظـرة)، واتە : چەند روخـــاری هەن کە لە روژی قیامەتا زور جوانو تیـــرینن ، لــــەو روخـــارانە روی ئەو موسولمانانەن کەئەروانـــن بو خوای خـــویانو ، خوائەبینن ، وە لە یەکەمکتیبی حەدیثی پیغەمبەرا (درووودی خوای لی بی ) ، کە (بخاری)ی شەریفە ، ریوایەت کــراوە لە (ابو هـــریرة)وە ، (خوای لی رازیبی)کە روژی کومەلی لە ئەصحابو یارانی پیغەمبەر عەرزیانکرد : ئەی پیغەمبەریخوا ! ئایا ئیمە لە روژی قیامەتا خوای گەورەمان چاو پیئەکەوی ؟ ئەویش لە وەلاما فەرمووی : ـ ئایا ئیوە گوماتان هەیە لە چاو پیئەوتنی مانگی چواردە ، لە شەویکا هەور بە ئاسمانەوە نەبی ؟ ، عەرزیان کرد نەخەیر ! ، پاشی ئەوە فـــەرسووی :ـــ ئەی گوماتان هەیە لە چاوپیکەوتنـــی هەتاوا لــــە روژیـــکا هـــەور بەئاسمانەوە نەبی ؟ عەرزیان کرد : نەخەیر ! ، ئەمجا فەرمووی :ـــ دەی بە راستی وەکوو مانگی چواردە ئەبینن لەشەویکا کـــە ســـامالبیو ، وەکوو هەتاو ئەبینن لە روژیکا سایەقە بی ، وەها لە روژی قیامەتا داتی خوای گەورە ئە بینن . .

**برا موسولمانەکان !**

بەپیی مانای ئەو ئایەتەو ، ئەم حەدیثە پیروزە هیچ گومان نیـــە لەوەدا کە موسولمانان ، هەموو ، لە روژیقیامەتا بە خزمـــەتی خـــوای گەورە ئەگەنو ، چاویان پیئەکەویو ، بەم چاو پیکەوتنە ، بەرادەیەك دلخوشو شادمان ئەبن ، هەرگیز بەیان ناکری بو ئینسانو ، پایەکەی دەرناکەوی ، مەگەر بو ئەو کەسەی کەخوی پییئەگات ، بەلام چونیەتی

ئەم بینینە ئیستاو لەمجیهانەدا ، بو ئیمە نازانریو بـــە هەرجوری بیری لیبکەینەوە پیی ناگەینو ، بە تەواوی تیی ناگەین ، تەنهـا ئەوەندە پیویستە لەسەرمان باوەرمان وەهابی کە بە چاوی سەر ذاتی خوای گەورە ئەبینین ، ئیتر ئەیدەینە دەس عیلمیخوا ، خـوی ، هەتا روژی خوی ، هەروەها پیویستە بزانن ئەوەی کافرییو ، باوەرو ئیمانی بەخواو پیغەمەران نەبی ، لە بینینی خوای گەورە بیبەشە ، لـــە (بخاری)ی شەریفا روایەت کراوە کە پیغەمەر (دروودی خوای لیبی) فەرموویەتی لە روژی قیامەتا،کاتی کە ئادەمیزاد هەموو گردئەکرینەوە، جار ئەدری بەناویانا هەر کەس هەرچی پەرستووە لە دنیادا ئیستە ئەبی بکەویتە شوینی ، لەویدا هەندی کەس ئەلین ئیمە روژمان پەرستووە ، وە هەندی ئەلین ئیمە ئاگرمان پەرستـــووە ، یا بتمـــان پەرستـــووە ، وائەزانن کە لەو روژەدا ئەو هەتاوو ئاگرو بتە رزگاریان ئەکەن ، وە لەسەر ئەم ئیقراری خویانـە ئەوانـە ئەسپیررین بـە دوزەخ ، وە ئەوکەسانەی کە خوای گەورەیان پەرستووەو باوەریان بە پیغەمەران بووە ، لە شوینی خویانا ئەمیننەوە . پاشئەوە خوای گەورە خـــوی پیشانی ئەو موسولمانانە ئەدا ، بەلام لە یەکەم جارا نایناسنو ، داوای ئەوە ئەکەن کە خوای گەورە ببینن ، چونکە خوی بەلینی پی داون ، ئەمجارە خوای گەورە بەجوری خوی دەرئەخا بویان کە هـەمـــوویان ئەیناسنو ، قسەیان لەگەلئەکاو ، ئەفەرمویت من خـــوایئیـــوەمو ، پەروەردگاری ئیوەم ، ئەوانیش عەرزی ئەکەن بەلی هەمـــوو باوەرمان هەیە کە تو خوای ئیمەی ، جا خوای گەورە، بە میهرەبانیی خـــوی ، تیشکی لوطفو بەزەیی خوی ئەخاتە سەریان بەجوری کـــە هەمـــوو ، لەخوشیانا ، سەرمەست ئەبن، ئەمە لیکدانەوەی ئەو ئایەتەیە کە خـــوا فەرموویەتی (للذین احسنوا الحسنی وزیادة) واتە : بوئەو کەسانە کـــە بیروباوەرو ، رەفتاری باشیان بووە جەزایچاك و پاداشی باش هەیە لەگەل زیادەییکا ، کە بریتییە لە چاو پیکەوتنی خوای گەورە .

× × ×

الحمد لله ثم الحمد لله ۰ الحمد لله الذي افاض على المؤمنين نعمه وآلاءه ، وخصهم في الاخرة برؤيته ولقائه ۰

احمده واشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ، وان سيدنا محمدا عبده ورسوله خاتم انبيائه ۰ اللهم صل على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه واتباعه الى يوم الحشر تحت لوائه ، خصوصا على سادة ديننا ذوى القدر العلى والفخر الجلى سيدنا ابى بكر وعمر وعثمان وعلى ، وعلى الحسن والحسين وحمزه والعباس ، وعلى الستة الباقية من العشرة المبشرة رضوان الله تعالى عليهم اجمعين ۰

اوصيكم ايها الناس ، ونفسى اولا ، بتقوى الله وطاعته ، فان الله مع الذين اتقوا، والذين هم محسنون ۰

ايها المسلمون! قال تعالى (وجوه يومئذ ناضرة، انى ربها ناظرة ، ووجوه يومئذ باسرة ، تظن ان يفعل بها فاقرة) افادت هذه الاية الكريمة ان الله تعالى يمن على عباده المؤمنين بنعمة روءيته ولقائه، وان وجوه المؤمنين ناضرة ، يجرى فيها ماء المحبة والسرور ، وهم مغمورون في نشاط القلب وصفائه ، وان الكافرين محروءون عن هذه النعمة العظيمة (كلا انهم عن ربهم يومئذ لمحجوبون)، وذلك اثر معصية العبد واتباع اهوائه ، وقال ، صلى الله عليه وسلم ، (انكم سترون ربكم كما ترون القمر ليلة البدر) وهذا الحديث مشهور ، رواه واحد وعشرون من اكابر الصحابة ، رضوان الله تعالى عليهم اجمعين ۰

ايها الاخوان ! هذه النعمة العظيمة ، وان كانت فضلا من الله ورحمة بعباده المؤمنين ، فانها نعمة جليلة وعد بها المؤمنين من عباده جزاء على العبادة ، كما قال تعالى ( للذين احسنوا الحسنى وزيادة) ۰ فاحسنوا باطاعة ربكم، كما احسن الله اليكم بهدايته لكم الى سبيل السعادة ، اقول قولى هذا ، واستغفر الله لى ولكم ، فاستغفروه ، انه هو الغفور الرحيم ۰

# خوتبەی پینجەم بـــومانـــــگی موحەرڕەم

**برا موسولمانەکان !**

لەم چەند جومعەیەی پیشوودا باسی ئیمانمان کرد ، یانی باوەر بە ذاتو صیفەتەکانی خوا ، جا بو لیکولینەوەیەکی کەم لەو باســـە پیشووانە ، ئەبی بزانین ئادەمـــیزادی ژیر کەمی بیر بکاتەوە ئەزانی خوای گەورە ئەم ئادەمیزادەی جیا کردووەتەوە لە هەموو گیان لەبەری بەهوی عەقلو هوشەوە ..ئەم عەقلە بوئـــەوە دروستکـــراوە کـــە روژبەروژ ئادەمیزاد،لە کاروباری دین ودونیادا، رووی لە بەرزی بیو، هەنگاو بنی لە خراپەوە بو چاكو ، لە چاکەوە بوچاکتـــرو ، لەســـــەر بیری خوی هەرشتی بەسوودبی بوی دەردەستی بکاتو ، هەرشتـــی زیانی هەبی بەرنگاری بیو بەربەستی بکات ، جا لەسەر ئەم ئاسای بیرو هوشە ئیمە ئەزانین هەرگیـــز عـــەقل باوەر ناکا بەوە خانـــوویەك هەبیو کەس نەیکردبیتەوە ، کتیبیك هەبیو کەس نەینووسیبیتەوە، جوگەیەك هەلگیرابی بو سەر کشتـــوکالو ، کـــەس ئەو جوگـــەیەی هەلنەگرتبی ، ئەمانە هەموو لەلامان دیارن کە پیویستیـــان بە کەســـی هەیە ئیشی تیا کردبن ، کەواتە چون ئادەمیزاد باوەر بکا بەوەی ئـــەم عەرزو ئاسمانە ، ئەم ساراو بیابانە ، ئەم هەردو کیـــوانە ، ئەم دەریاو روبارانە ، ئەم ئەستیرە جوانانە ، ئەم هاتووچووە ریكوپیکانە ، ئـــەم گورانی شەوو روژو زەمانە ، ئەم بەفروا بارانە ، ئەم باو بورانە ، ئەم کەمو زیادانە ، ئەم ژیانەوەی گیاو دارو درەختانە ، لەخویانەوە بی ، کە نە شعوریان هەیەو نە هوشو ، بەرزترینی ئەم دروسکراوانە ، کە ئادەمیزادە ، ئەویش لە پەیدابونو ، لە ژیانو ، لە نەخوشییو ، لـــە بەرزیو نزمیو ، لە بەختەوەریو چارەرەشیی خوی سەراسیمەیـــەو سەرگەردانە ، کەواتە ئەم جیهانە ، بە خویو هەرچی تیایە ، دەسکاری قودرەتی پەروەردگاریکە ، کە زیندووە ، خاوەن علمو زانایەو ،خاوەن ئیرادەو خواستە ، خاوەن قودەرتو توانایەو ، بیسەرو بینایە ، چونکە

عەقلی ئینسان باوەر ناکات مردوو ، لە کاتی مردنا ، خانوو درووست بکە یاخود یەکیکی شیت‌ونەزان‌و شەل‌و کویر کوشکیك درووست بکات .
هەر هوشیاری تەماشای بالەخانەیەك بکا ئەزانی ، هەتا ئەو بالەخانەیە دامەزراوترو دارێژراوترو ، خاوەن شیوەو جوانتـر بیت‌و ، نەخش‌و نیگارەکانی دلگیرتر بن ، وەستاکەی زاناترو بە رزترەو ، زیاتر پیـاو ناچار ئەبی دان بنی بە هونەرمەندی‌ی ئەو وەستایەدا .

جا بەم جورە ، ئەگەر ئادەمیزاد بروانی بوئەم نەخش‌و نیگاری ئاسمانە،بە هوی ئەو ئەستیرە جوانانەوەو،بیر بکاتەوە لە هات‌وچویان‌و پەلەو ئارامی‌یان‌و ، بروانی بو زنجیرەو رشتەی کیوان‌و ، ریزی دارو گولی رنگاورەنگی بیستانان‌و ، بروانی بو ئەم هەموو ئادەمیزادو گیان‌لەبەرانە ، کە هەریەکەی ، بەتایبەتی ، قەوارەو شیوەو رەنـگ‌و دەنگی جیاوازیان هەیە .. بە دل گەردن‌کەچ ئەبی‌و ، سەر دائەنەوینی بو ئەو پەروەردگارەکە ئەمانەی لە نەبوونەوە هیناوەتە مەیدانی بوون!!
ئەمجار ، بە سوزی دل‌و ، بە جوش‌و کـول ، سەر بەرز ئەکاتەوەو ، ئەپاریتەوەو ، ئەلی ئەی پەروەردگاری جیهان ! ئەی ئاشکرای پەنهان ! ئەی دیاری بە دەس‌کاری سەربیسات ! ئەی پەنهان بە حەقیقەتی زات ! ئیمان‌و باوەرم هەیە کە تو پەروەردگاری‌و هەی‌و ، هەر بووی‌و ، هەر ئەبی‌و ، لە هیچ شتیك لەم پەیدابووانە ناچیت‌و ، پیویستی‌و داماویت بە هیچ نیەو ، هەموو جیهان پیویستی‌و داماوی بە تو هەیەو ، هەر تو بوونت پیویستە ، هەر تو پەروەردگـــاری ، هەر تو بەندەگـــی‌و فەرمان‌بەرداریـــت بو ئەکریت‌و ، رەوا نیـــە بو کەسی‌تر سوجـــدەو کورنوشی عیبادەت ببری ، ئەی پەروەردگاری جیهان ! توی ، بـــە راستی ، زیندوو زاناو ، خاوەن خواست‌و تواناو ، بیسەرو بیناو لـــە هەموو خەوشی دووری ، هەرچی شیاوی گەورەیی بی هەر بو تویـــە بە راستی ، ئەی پەروەردگاری میهرەبان ، هەروەك درووستت کردووین لیت ئەپارینەوە شارەزامان بکەیت بو هەموو فەرمانیکی بەسوودو ، یارمەتیمان بدەی لەسەر ئەوەی بیکەین‌و ، ئیمان بگەیینی لە هەموو

زیانیك‌و بمان‌پاریزی لی‌ی • خوایه هه‌روه‌كو له نه‌بوونه‌وه ئیمه‌ت دروست كردوه ، به سه‌ریه‌رزی بمان‌ژیینه‌و ، به سه‌رفرازی بمان‌مرینه یا ارحم الراحمین •

× × ×

الحمد لله ، ثم الحمد لله ، الحمد لله الذي جعل الظلمات والنور، وهدى العباد الى الرشاد بنور الدين واوصلهم الى الجزاء الموفور ، احمده واشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ، وان سيدنا محمدا عبده ورسوله المؤيد المنصور • اللهم صل على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه واتباعه الى يوم النشور ، خصوصا ، على سادة ديننا ذوى القدر العلي والفخر الجلي سيدنا ابى بكر وعمر وعثمان وعلى ، وعلى الحسن والحسين وحمزة والعباس ، وعلى الستة الباقية من العشرة المبشرة ، رضوان الله تعالى عليهم اجمعين •

اوصيكم ايها الناس ، ونفسى اولا ، بتقوى الله وطاعته ، فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون •

ايها المؤمنون ! قال تعالى : ـ ومن آياته خلق السموات والارض واختلاف السنتكم والوانكم ، ان في ذلك لآيات للعالمين ، نعم كل ذلك دليل على ان الكائنات من الارض والسموات ، ومن الغيب والشهادات ومن الانسان وسائر الحيوانات ، ومن النبات وسائر الجمادات وغيرها مخلوق لخالق واجب الوجود ، موصوف بالكمالات ، منزه عن النقائص وعيوب الذات والصفات ، الا هو الله رب الارض والسموات ••

اعوذ بالله من الشيطان الرحيم

(ان في خلق السموات والارض واختلاف الليل والنهار لآيات لاولى الالباب) لبهني الله واياكم من نومة الغافلين ، وحشرني واياكم تحت لواء سيد المرسلين •

# خوتبەکانی مانگی صــــەفەر

## خوتبەی یەکەم

براکانم !

لەسەر فەرمودەی پیغەمبەر دروودی خوای لی‌بی ، مەبەست لە رەوانە کردنی ئەو زاتە بەرزە ئەوە بووە کە خوو رەوشتی باش لــە جیهانا تەواو بکات ، ئەم زاتە ، لە گەل ئەوەدا کە گـــــەلی ئیشی گەورەو گرنگی کردووەو ، موعجیزاتی زوری بووە ، خوای گەورە لە قورئانی پیروزا بەوە مەدەحو ثەنای ئەکات کە ئەفەرمویت (وانك لعلی خلق عظیــم ) واتە : بەراستی تو لەسەر خـــوو رەوشتیکـــی گـــــەورەی ••

بەلی خوو رەوشتی گەورە بناغەی هەموو سەربەرزی‌و هەموو سەرفرازی‌و رزگاری‌یەکە لە دونیاو قیامەتدا ، بەراســـتی ئادەمیزاد بە رەوشتی باش لە پاشەروژا رزگار ئەبی‌و ، بــە رەوشتــی بــاش ئەگات بە پایەی بەرزی زانستو زانیاری‌و ئاوەدان کــــــردنەوەی ولاتو ، کامەرانی‌و بەختیاری مســـوگەر ئەکات ، بە کورتی رەوشتی باش ئەبیتە هوی سوودی نەبراوەی گشتي ••

جا لەسەر ئەم بناغەیە حەزرەتی پیغەمبەر،دروودی خوای لی‌بی، فەرمویەتی : چاکترین کەس لە ئوممەتی من ئەوکەسانەن کە شەهـدەت ئەدەنو ئەلین (اشهد ان لااله الا الله، واشهد ان محمدا رسول الله)،وە ئەوکەسانەن ئەگەر ئیشی‌باش بکەن پی‌ی دلشاد ئەبن‌و ، ئیشی خراپ بکەن دریژەی پی‌نادەنو ، زووبەزوو لی‌ی پەشیمان ئەبنەوەو ، داوای عەفوی خوا ئەکەن لە تاوانەکەیانو ، دینەوە سەر ریگای راست • وە خراپ‌ترین کەس لە ئوممەتی من ئەوانەن کە لەناو رابواردنو ئارەزوی نەفس‌و شـــەهوەترانی‌یا ئەژین ، ئەوانـــەی کە هەمیشە حیرســـیان

لەسەر حواردەمەبی رنکاورەنگەو ، واتەی بی‌ئەساس‌و زمان‌بازی ئەکەن بە بی‌کردەوەی پیاوانەی باش •

هەروەها پیغەمەر، دروودی خوای لی‌بی، فەرموویەتی :باشترین کەس لە ئیوە ئەوکەسەیە کە بە چاوپی‌کەوتنی ئەو خواتان بکەویتەوە بیرو ، بەقسەکردنی ئەو زانستی ئیوە زیادبی‌و ، کردەوەی ئەو بتان‌خاتە سەر مەیل‌و خواستی کردەوەی باش • واتە : ئەوەندە بە یادی خوا دلی نوورانی‌و روناك بی ، کاتی کە چاوتان پی‌کەوت ، بە روناکی‌ی ناوچاوانی ئەو خواتان بکەویتەوە یادو ، ئەوندە خاوەن زانست بی،قسەکردنی ئەو ببی بە دەرس بو ئیوەو،تەمی‌و ئاموژگاری‌ی لی وەربگرن‌و ، کردەوەی ئەو ئەوەندە ریك‌و راست بی ، کە چاوتان کەوت بە کردەوەی ئیوەش شەوقتان بجولی بو کردەوەو رەفتاری‌باش •

لەبەرئەوەی کە خووی میهرەبانی لە ئادەمیزادا ئەبی بە هەوینی هەموو چاکەییك ، پیغەمەری خوا ، دروودی لەسەر بی ، ئەفەرمویت چاکترینی ئوممەتی من ئەوکەسەیە ، کە لەگەل تیژی سروشتی‌یا ، هەر کاتی رقی هەلسی ، بە بی‌ئەوەی زیان بگەیینی بە خەلك،زووبەزوو بیر بکاتەوەو ، لەو حالە نالەبارە پەشیمان ببیتەوە بو سەر خووی نەرم‌و ئارام‌و میهرەبانی •

هەروەها فەرموویەتی :ــ چاکترینی یاران ئەو یارەیە کە بەرامبەر بە هاوری‌ی خوی سوودی زوری هەبی ، یانی : لەکاتی هەلەو هەل‌خلیسکانیا دەستی بگری‌و ئاموژگاری‌ی بکات‌و، لەکاتی نەبوونی‌و کوسپ‌و گری‌ی ریگەی ژیانیا ، دەست بگری بە بالیەوەو ، یارمەتی‌ی بدات ، هەتا رزگار ئەبی‌و ، لە بەرەورووا حورمەتی بگری‌و ، لە پاش‌ملەدا شەرەف‌و ناموسی بپاریزی‌و ، لە ناساغی‌دا سەری لی بدات‌و ، لەپاش مردنی دوعای خیری بو بکات‌و سوودی هەبی بو ئەولادو خیزان‌و ئەوانەی لەپاشی بەجی‌ماون لە هەموو روویەکی

ماددي و مەعنەوی‌یەوەو ، باشترین دراوسی ئەوەیە کە باش بی بو دراوسی‌کانی‌و ، ئابرووی‌یان بپاریزی‌و ، ئازارو ئەزیەتیان بە سینەیەکی گوشادەوە وەربگری‌و ، دلسوزی‌یان لەگەل بکات‌و ، ئەگەر خراپەییکیان هەبوو خەوشیان داپوشی‌و ، ئەگەر چاکەیان هەبوو بلاوی بکاتەوە •

ئەمە چەند بەشیك بوون لە خوو رەوشتی باش‌و بەکورسی خوی باش هوی خوشی‌و ئارامی جیهانە ، بەتایبەتی ئەم رەوشتی باشە بو ئەوکەسانەی کە سەرکردەی ، گەلن‌و ، ماموستای دانشگاو ، گەورەی بنەمالەن ، زوربەنرخ‌و بەسوودە ، وە ئەگەرچی هیز ئەبیتە هوی ئەوەی کە پیاو پایەو مەقامی دەس‌کەوی ، بەلام هەر خوو رەوشتی باش ئەبیتە هوی هیشتنەوەو پایەداری‌ی ئەوپایەو مەقامە •

× × ×

الحمدلله ، ثم الحمدلله ، الحمدلله الذى نور الانفس ، وعمر الآفاق بمحاسن مكارم الاخلاق، احمده واشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له ، وان سيدنا ومولانا محمدا عبده ورسوله المرغب فى الاعتصام والاتفاق • اللهم صل وسلم على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه واتباعه الثابتين على العهد والميثاق •• خصوصا على سادة ديننا ذوى القدر العلي والفخر الجلي سيدنا ابى بكر وعمر وعثمان وعلي ، وعلى الحسن والحسين وحمزة والعباس ، وعلى الستة الباقية من العشرة المبشرة رضوان الله تعالى عليهم اجمعين •

اوصيكم ايها الناس ، ونفسى اولا ، بتقوى الله وطاعته ، فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون • ايها المؤمنون ! قال الله تعالى فى الثناء على رسوله الكريم :ــ (وانك لعلى خلق عظيم) ، وقال رسول الله صلى الله عليه وسلم ، (بعثت لاتمم مكارم الاخلاق) • نعم ان الخلق الحسان تمت ببعث هذا النبي الجليل ، وقد جمع ما تحلى به الانبياء والرسل الكرام من الاخلاق الكريمة • قال تعالى (اولئك الذين

هداهم الله فبهداهم اقتده)، وقال :ـ فبمارحمة من الله لنت لهم ، وقال، آمرا حبيبه الامين : (خذ العفو ، وأمر بالعرف ، واعرض عن الجاهلين) ولاشك ان هذا الرسول الممثل لاوامر الخالق قد اتصف بالخلق الكريمة واثارها عقيدة وعملا وترغيبا للعالمين •

ومن جملة ما نشره منها ما تضمنه قوله الكريم (خياركم من ذكركم بالله روءيته ، وزاد في علمكم منطقه ، ورغبكم في الاخرة عمله) ،وقوله العظيم (خيار امتي احدائهم ، الذين اذا غضبوا رجعوا ••) ، وقولــــه خير الاصحاب عند الله خيرهم لصاحبه ، وخير الجيران عند الله خيرهم لجــاره •

اعوذ بالله من الشيطان الرجيم •

(وهذا صراط ربك مستقيما ، قد فصلنا الآيات لقوم يذكرون) • نبهني الله واياكم من نومة الغافلين ، وحشرني واياكم تحت لواء سيد المرسلـــــــــين •

## خوتبـــەی دووهەم بۆ مانگی صــــەفەر

**برا موسولمانەکان !**

ئیمانو باوەر بە مەلائیکە روکنیکە لە ئەرکانی ئیمان ، ئیمـــــان بەمەلائیکە ئەوەیە باوەرت ببی ئەمانە جورە گیان لەبەریکن خـــوای گەورە دروستی کردوونو ، لەشیان ناسكو نوورانی‌یە ، وەکوو ئاوو هەواو شوعلەی چراو ، ئەم فریشتانە دوورن لە نیشانەی پیاوو ژنو ، هەریەکی لەمانە خوا بەشیوەیەکی تایبەتی دروستی کردووە،هەندیکیان دوو بالو ، هەندی سی بالو ، هەندیکی‌تریان چـــوار بالیان هەیەو ، ئەتوانن بە هەموو شیوەیەك خویان بگورن ، وەکوو حەزرەتی جبرئیل کە هەندی‌جار بە شیوەی خوی‌و ، جارجار بە شیوەی (دوحیە)ناو ، کە پیاویکی سیماجوانی خەلکی مەککە بووە ، خوی دەرخستووە بـــــو حەزرەتی پیغەمبەرو ، قورئانی پیروزی بەسەرا خویندووەتەوە •

براکانم ! زانینی ئەوزاعی مەلائیکە حەوالەی عیلمی خوایەو ، بو موسولمان ئەوەندە پیویستە کە ئیمانو باوەری ببی بەوەی کە مەد'نیکە هەنو ، مەعصوومن ،واتە : پاکن لەگوناحو ، هەرچی خوای گـەورە ئەمریان پیبکا ئەیکەنو ، هەرگیز بیئەمریی خـوایان نەکردووەو نایکەن • ئیمە ژیانو خوشیمان بە خواردنو خواردنەوەیە، بەلام ئەوان ژیانو خوشییان بە تاعەتو ذیکری خوایە ••

لەسەر بەیانی قورئان هەندیلەمەلائیکە (مقرب)و پایەیان بەرزەو، لایخوا زور بەقەدرن، ئەمانە هەندیکیان لەقورئانا ناویان هەیە، وەکوو جبرئیلو میکائیلو ، هەندیکیان لەحەدیثـا ناویانهاتـووە ، وەکـوو عزرائیلو اسرافیل ، جبرئیل (وحی)ی هیناوە بو لای پیغەمەران ،یانی کەلامی خواو ، ئەمرو نەهیو ئەحکامی ئەو ، واتە هەر لـە زەمانـی حەزرەتی (ادم)ەوە تا زەمانی حەزرەتی (محمد) کـە خاتـەمو ئاخری پیغەمەرانە ، جبرائیل دەستووری خوای هیناوە بـو پیغەمەران ، کەبیگەیەنن بەئادەمیزاد•هەروەها میکائیل مەئمووری رزقو روزییەو، عزرائیل مەئمووری گیانکیشانەو ، اسرافیل مەئمووری ئەوەیە لەکاتی دوایی هاتنی دونیادا دووجار فوو بکات بە (صور)دا ، بە جاری یەکەم هەموو گیانلەبەر ئەمرنو، بە جاری دووهەم هەموو زیندوو ئەبنەوە، جا خوا حەشریان ئەکات••، (صور)، لەسەر بەیانی حەدیثی پیغەمەر ، شاخیکە دوو جار اسرافیل فووی پیا ئەکات •هەروەها چوار مەلائیکە لە دونیادا عەرشیان هەلگرتوەو ، لە روژی قیامەتا ئەبن بە هەشـتو ، هەندی لە مەلائیکە مەئمووریباو، هەورو، بەفرو بارانو ، هەندیکیان مەئمووری پاراستنی نەفسی ئادەمیزادن ، لە سکی دایکاو ، لە ماوەی ژیانا ، هەروەها لە قورئانا هەیە کە چەنـــد جار خوا مەلائیکـــەی ناردوە بو یارمەتیی حەزرەتو هاوریکانی ، لە کاتی غـەزای بـەدرو حونەیندا، لە ولاتی حیجاز • هەروەها لە حەدیثا هەیە کە مەلائیکــە حازر ئەبن بو یارمەتیی ئادەمیزادی باشو ، لە تەنگانەدا ئەکەونە فریایو ، لە قورئانی پیروزدا هەیە کە مەلائیکە ، لە دونیادا، کردەوەی

چاكو خراپی ئادەمیزاد ئەنووسن‌و ، لە حەدیثا هەیە ئەوەی چاكـــــە ئەنووسی لە سەر شانی راستەو ، ئەوەی خراپە ئەنووسی لە سەر شانی چەپەو ، ئەمانە ، دوودوو ، لە شەوو رۆژا ئەگۆرین ، هەروەها لـــە حەدیثا هەیە كە ئادەمیزاد ، پاش ئەوەی مردو ، تەسلیمی شوێنی خۆی كرا ، دوو مەلائیكە ئەرونە سەری‌و پرسیاری لی‌ئەكەن لـــە خواو پیغەمبەرو ئایین‌و ئیمام‌و قیبلەی، جانەو كەسە كە لە دونیادا ئیمانـــی دامەزراو بووە زور بەرەوانی جوابیان ئەداتەوەو ، ئەوەی ئیمانـــی دانەمەزراو بی ناتوانی جوابیان بداتەوە • هەروەها لە حەدیثا هەیە كە هەندی مەلائیكە مەئموورن بو عەزاب‌و ئازاردانی ئادەمیزادی تاوانبار لە قەبراو ، لە ئایەتا هەیە كە لە رۆژی قیامەتا ، لەوكاتەدا خوای گەورە ئەیەوی حەشری عالەم بكا ، هەر نەفسیك ، موسولمان ، یاكافـــر دوو مەلائیكەی لەگەلدایە، یەكیكیان مەئمووری بردیـــەتی بو شوینـــــی حیساب‌و ، یەكیكیان شاهیدی كردەوەیەتی‌و ، شایەتی لەسەر ئەدا ، یا شایەتی بـــو ئـــەدا •

هەروەها ، لە ئایەتا هەیە كـــــە نوزدە تاقـــم ، یانوزدە كەس مەئموورن لەسەر دوزەخ‌و گەورەكەیان ناوی (مالیك)ەو ، گەلیـــــك مەلائیكەیش مەئمووری بەهەشتن‌و ، لە حەدیثایە كە گەورەكەیان ناوی (رضوانە)و ، ئینسانی موسولمان كە نزیكی بەهەشـــــت كەوتـــەوە ، مەلائیكەی رەحمەت دین بە پیشوازی‌یەوە ، بەخیرهاتنی لی ئەكـــەن‌و سەلامی لی‌ئەكەن‌و ، پیروزبایی لی ئەكەن •

براكانم ! ئەمانە كە ووتمان زوربەیان لە قورئاناو ، هەندیكیان لەحەدیثایەو ، پیویستە باوەرمان پی‌بی‌و ، بەراستی بزانین ، هەركەسی توزی تەماشای ئەم عەرزو ئاسمان‌و ئەستیرەو لەخشە جوانانە بكاو ، كەمیك لە شتی عەجایەبی ئەم جیهانە بكولیتـــەوە ، بەلكو هەرلـــــە دروست كردنی نەفسی خوی‌و قەوارەو رەگ‌و ئیســـقان‌و مەكینـــەی دل‌و باقی وردە رەگ‌و دەماخ‌و غـــەیری ئەمانە تی‌فكری لـــە گەورەیی‌و هیزو قودرەتی خوا سەرسام ئەبی‌و ، باوەر ئەكات بەوەی كە هەموو

شتی بو خوای گەورە ئاسانە ، ئەم جیهانە لەمەوبەر نەبووەو ، خـــوا دروستی کردوەو ، ئیمە خومان ، لەمەوبەر نەبووینو ، خوا دروستـــی کردوین مەلائیکەش جورە مەخلووقیکـــن زوو نەبوونو ، خوای گەورە دروستی کردوون ، هەروەها دونیای پاشەروژیش ، وەکـــو ئەم دونیا وایە ، چون خوا ئەم دونیایەی لە نەبوون دروست کردووە ، ئەو دونیایەیش دروست ئەکاتو ، حالی حازر بەهەشـــتو جەهەننەم دروست کراوو ئامادەن بو ئەوکەسانەی ئەرونە ناویان •

هەر کەسیك توزی لە ئەوزاعـــی نووستنی خـــوی ورد بیتەوە ، کە جارجار خەوی وەها ئەبینی وەختە لەترسا شیت بیو رائەپەریو ، گەلی جاریش خەوی وەها خوش ئەبینی زور دلشاد ئەبیو ، کەسیـــش ئاگای لەو وەزعە نی‌یە، بوی دەرئەکەوی کە عەزابو نیعمەتو پرسیارو وەلامی قەبریش هەر بەوچەشنەیە، بی‌گومان هەرکەس توزی بە ذلیکی روناکەوە بیر بکاتەوە ، ئیمانو باوەری بەهیز ئەبی لەسەر ئەوزاعی مەلائیکەو قەبرو قیامەتو ، جەهەننەمو بەهەشـــــتو ، بەدل لەخوا ئەپاریتەوە کە لە رەحمەت لای‌داو، قاپی‌ی رەحمەتی خوی لی بکاتەوە•

× × ×

الحمدلله ، ثم الحمدلله ، الحمدلله المتفرد بالخلق والابداع ،جاعل الملائکة اولی اجنحة ، مثنی ، وثلاث ، ورباع • احمده واشهد ان لااله الا الله وحده لاشریك له ، وان سیدنا محمدا عبده ورسوله الهـــادی النفاع ، اللهم صل علی سیدنا ومولانا محمد وعلی اله وصحبه وسائـــر الامة المهتدیة بالاتباع ، وسلم تسلیما ، خصوصا علی سادة دیننـــا دوی القدر العلی والنور البهی والفخر الجلی سیدنا ابی بکر وعمر وعثمـــان وعلی ، وعلی الحسن والحسین وحمزة والعباس ، وعلی الستة الباقیـــة من العشرة المبشرة ، رضوان الله تعالی علیهم اجمعین •

اوصیکم ایها الناس ! ونفسی اولا ، بتقوی الله وطاعتـــه ، فان الله مع الذین اتقوا والذین هم محسنون • ایها الاخوان ! قال تعالی —

عز من قائل ــ (امن الرسول بما انزل اليه من ربه والمؤمنون ، كل امن بالله وملائكته وكتبه ورسله ... هذه الآية الكريمة ترشدنا الى ان من اركان الايمان الايمان بالملائكة الكرام وقد خلقهم الله اجساما لطيفة نورانية، قد يظهرون بصور مختلفة محترمة، وهم عن الذنوب معصومون، لايعصون الله ماامرهم ويفعلون مايوءمرون ، ومنهم المقربون ، والكرام الكاتبون وحملة العرش ، والحافظون ، ومنهم المأمورون لسؤال القبر ، ومنهم السائق والشهيد في يوم النشور ، ومنهم خزنة النار ، وخزنة الجنة دار الابرار ،فآمنوا بهم وبما جاءبه الرسول الامين لعلكم تفلحون. اعوذ بالله من الشيطان الرجيم ان في هذا لبلاغا لقوم عابدين ، ومالرسلناك الا رحمة للعالمين .... نبهني الله واياكم من نومة الغافلين، وحشرني واياكم تحت لواء سيد المرسلين .

## خوتبەی سێهەم بۆ مانگی صەفەر

**برا خۆشەویستەکانم !**

خوای گەورە ، کە ئادەمیزادو پەری‌ی دروست کرد ، بۆئەوەی دروست کردوون کە عیبادەت‌و بەندەیی خوا بکەن‌و، لەسەر فەرمانی ئەو رەفتار بکەن ، بۆئەوەی لە دونیاو قیامەتا سەربەرز بن، هەر لەسەر ئەم حیکمەتەیە کە پێغەمەرانی ناردوە بۆ لایان‌و کتێبی ناردوە بۆ پێغەمەرەکان ، تا ئاموژگاری‌یان بکەن‌و ، دەرسیان لێ وەربگرن .

براکانم ! لەوانەیە خەیال بکەن ، مادام ئادەمیزاد خاوەنی عەقل‌و هوشە ، ئیتر ئاموژگاری‌ی ناوی ، بەلام ئەم خەیالە بەتالە، چونکە ئادەمیزاد ، باخاون عەقل بی‌و، عەقل ئەبێتە هوی بیرکردنەوەو راوێژکردن ، بەلام تەنها بە عەقلی خوی ، بە ئاسانی‌و زوو بە زوو ، هەموو شتێکی بو روون نابێتەوە ، پێویستی بە رەهنومایەکە یارمەتی‌ی بدات ، زور ئادەمیزادی بەهوش‌وفام هەیە ، لە ئیش‌و کاری خویا سەری لی‌ئەشێوی، هەتا پەنا ئەباتە بەر یەکی چارەی بکا ، بیجگە

لەمە، هەموو عەقلیك ئەو عەقلە نی‌یە کە بگاتە بنج‌و بناوانی هەموو شتیك ، ئەوەتە ئەبینین چوار برا وان بەیەکەوەو لەیەك باوك‌و دایك پەیدا بوون ، کەچی یەکیکیان عەقلی زور تیژەو ، زور شت ئەزانی‌و ، ئەوانی‌تر زور دواکەوتوون ، کەواتە عەقل، هەرچەند شتیکی بەسوودو قازانجە ، بەلام بە هەموو شتیکا ناگات ، بە تایبەتی ، لەو شتانەدا کە نادیارو پەنهانن‌و ، لەئەنجاما ئینسان هەر پیویستی بە رەهنوما هەیە ، زانا بەرزەکان چاویان بە وینەی عەقل داناوەو ، وتوویانە ئینسانیکی غەریب ریگەی بکەویتە بیابانی ، یا کیوی ، هەرچەند چاوی هەیەو ، خوی لە بەرزی‌یەوە فری ناداو ، خوی ناخاتە ناو چالەوە ، بەلام مادام غەریبەو ناشارەزایە پیویستی هەیە بە کەسیکی شارەزا کە ری‌نموونی‌ی بکات ، ئەگینا بە نابەلەدی‌ی ئەروا بەو دەشتەدا ، یا بەو کیوەدا ،هەتا شەوی بەسەرا دیت ، ئەوجا یا لەبرسا ئەمری ، یا درروندە ئەیخوا ،یا بە فەلاکەت رزگاری ئەبی ، لەسەر ئەم وینەیە ، ئەم جیهانە بیابانەو ، ئادەمیزاد ریبوارەو ، عەقل چاویەتی ، لەگەل ئەمەشدا هەر پیویستی بە شارەزایەکە ریگەی نیشان بدا،ئەم رەهبەرە برتی‌یە لە پیغەمبەرانو، ئەو شەریعەت‌و ئایینانە کە لای خواوە هاتوون بویان‌و ، هەموو ئادەمیزادیك پیویستی بەم دەلیلە هەیە بوئەوەی گومرا نەبی ، جا ، لەبەر ئەوە هەموو کەس بوی ناکری بروات بو قوتابخانەو بخوینی ، پیویستە لەسەر هەموو موسولمانی ، بە هەر جوریك بووە ، واجباتی ئایینی خوی فیر ببی‌و ، زور سوود بەخشە کە ، لە هەر شوینیکا ، عالمیکی دینی مەجلیسی نەسیحەت‌و ئاموژگاری‌ی هەبوو ، چ بەهوی خوتبەی نویژی جومعەوە ، یا بەهوی ئاموژگاری‌ی مانگی رەمەزانەوە ، یا بەهوی هەر کوبوونەوەیەکی خەلکەوە بی ، ئینسان بروا بو ئەو شوینەو ، گوی راگری‌و ، بە دل هوشیار بی بو ئەو ئاموژگاری‌یانەو ، باش فیریان ببی‌و، لە ژیانی خویا رەفتاریان پی بکات .

ئەگیرنەوە روژی حەزرەت ، دروودی خوای لی بی ، لە مزگەوتا دانیشتبوو ، لەگەل کومەلیك لە هاوریکانی ، ئاموژگاری‌ی ئەکردن ،

لە ناکاو سی کەس هاتنە ژوورەوە ، دوانیان روویان کردە مەجلیسەکەو،
یەکێکیان رویشتە دەرەوە،ئەو دوانەش یەکێکیان شوێنێکی دەس کەوت
لە ریزی کومەلەکەدا دانیشتو ، ئەویتریان جێگەی دەس نەکـــەوت
لەناویانا ، لە پشتیانەوە دانیشتو ، گوێی راگرت لە ئاموژگاری یەکەی
حەزرەت ، دروودی خوای لی بی ، کاتی کە حەزرەت ئاموژگاری یەکەی
تەواو کرد ، فەرمووی بە رەفیقەکانی :ـ خەبەرتان بدەمی لە ئەحوالی
ئەو سی کەسە ؟•• عەرزیان کرد بەلی •• ئەویش فەرمووی ئەوەیان
کە هات و لە ناوتانا دانیشت ئەوە داوای جێگەو مەئوای لە خوا کردو
خوا جێگەی پی داو جێگەی کردەوە ، دووهەمیان شەرمی کرد کــــە
داوای جێگە بکا ، بویە لەدواوە دانیشت ، خوای گەورەش شــــەرمی
کرد لەوەی کە بەشی گەورەی پی نەدا ، لەبەرئەوە ، هەرچەند لەدواوە
دانیشت ، بە سوودیکی گەورەو باش گەییشت ، بەلام سی هەمیان لایدا
لەم مەجلیسەو، رویشت و ، خوای گەورەش لایدا لەوو ، خیرو ئیحسانی
پی نەدا ••• مەبەس لەم حەدیثە پیروزە ئەوەیە کە ئینسان هەتا لـــە
توانایا هەبی ، پیویستە بړواتە نـــاو مەجلیسی ئاموژگاری ئینەوەو
بەشی خوی وەربگری •

برا خوشەویستەکانم ! بزانن ، چەندی عەقل و هوشی رووناك
بو ئادەمیزاد بەکارەو ، چەندی دەرس خویندن بەسوودەو ، چـــەندی
دانیشتن لە مەجلیسی ئاموژگاریدا قازانجی هەیە ، ئەوەندەش تیکەلی و
هاوری یی پیاوی دل پاك و ، بیر رووناك و ، خوورەوشت چاك بە سوودە،
گەلی ئینسانی وەها بوون نەیان خویندووە ، بەلام بەهوی گـــەوەوە
ماوەییك لەگەل پیاویکی باشی خاوەن دل و دین و رەوشـــتی بەنەمکین
رایان بواردووە ، بەهوی ئەو رەفاقەتەوە ، دلیان رووناك بووەتەوەو ،
خوویان بە باری چاکەدا گوراوەو ، بەهرەو بەشـــی دین و دنیایـــان
لەوکەسەوە وەگرتوە ، لە حەدیثی پیروزا وینەی رەفاقەتی چـــاکانی
هیناوەتەوە بە رەفاقەتی عەتتار ، کە ، ئەگەر عەتریشی لی وەرنەگری،
بونی خوشی لی وەرئەگری و وینەی رەفاقەتی پیاوی خراپیشــــــی

هیناوەتەوە بە دانیشتــن لای ئاسنگــەر ، کە یا بەرگو پوشاکــی دانیشتوەکە ئەسووتی ، یا سەری ئیشی !! بویە پیویستە پیاو هەمیشە تەماشای قازانجو سوودی دینو دونیای خویو برا موسولمانەکانــی بکاو ، هەر کردەوەیەك باشە خوی بیکاو ، بە خەلکیشی نیشان بدا •

× × ×

الحمد، ثم الحمد لله،الحمد لله الذی بعث الرسول لارشادالمکلفین، وقال : (وذکر فان الذکری تنفع المؤمنین) • احمده،واشهد ان لا اله الا الله ، وحده لاشريك له، وان سیدنا محمدا عبده ورسوله الهادیالناصح الامین • اللهم صل علی سیدنا محمد وعلی آله واصحابه واتباعه باحسان الی یوم الدین • خصوصا علی سادة دیننا ذوی القدر العلی والفخــر الجلي • سیدنا ابی بکر وعمر وعثمان وعلی ، وعلی الحسن واالحسین وحمزة والعباس ، وعلی الستة الباقیة من العشرة المبشرة • رضوان الله تعالی علیهم اجمعــین •

اوصیکم ایها الناس ! ونفسی اولا ، بتقوی الله وطاعته ، فان الله مع الذین اتقوا والذین هم محسنون • ایها المؤمنون ! قال اللــه تعالــی فاسألوا اهل الذکر ان کنتم لا تعلمون•وقال تعالی : یا ایها الذین آمنوا اتقوا الله وکونوا مع الصادقین•• هاتان الایتان الشریفتان تدلان علــی انه یجب علی المؤمن الاستبصار فی الدین وتعلم الاحکام الواجبة علیــه بقدر الاستطاعة والتمکین ، وسؤال العلماء والاستفادة من علمهم حتــی یحصل العلم وتزداد البصیرة ، ویفوز بنور الیقین ، وتدلان علی انــه یجب تقوی الله ، سبحانه وتعالی ، بامتثال اوامره واجتنــاب مناهیــه ، والمصاحبة مع الصادقین •• وعلی ذلك ینبغی للمسلم ان یغتنم الفرصــة لاستماع المواعظ وحضور مجلس الوعاظ الصادقین ، والناصحین • عن الحرث بن عوف ، رضی الله عنه ، ان رسول الله ، صلی الله علیه وسلم، بینما هو جالس في المسجد ، والناس معه ، اذ أقبل ثلاثة نفر ، فأقبــل اثنان الی رسول الله ، صلی الله علیه وسلم ، وذهب واحد ، فوقفا علی

رسول الله، فاما احدهما فرأى فرجة في الحلقة ، فجلس فيها ، واماالاخر فجلس خلفهم ، واما الثالث فادبر ذاهبا، فلما فرغ رسول الله ، صلى الله عليه وسلم ، قال : ــ الا اخبركم عن النفر الثلاثة ؟ .. اما احدهم فآوى الى الله ، فآواه الله ، واما الاخر فاستحيى ، فاستحيى الله منه ، واما الاخر فاعرض ، فاعرض الله عنه . اعوذ بالله من الشيطان الرجيم ، وذكر فان الذكرى تنفع المؤمنين . نبهني الله واياكم من نومة الغافلين ، وحشرني ، واياكم ، تحت لواء سيد المرسلين . آمين .

## خوتبەی چوارەم بو مانگی صەفەر

**برا موسولمانەکان !**

ئەمرو باسی ئەو کتیبانە ئەکەین کە خوای گەورە ناردوویی بو پیغەمبەران ، درودی خوایان لی بی ..

برا خوشەویستەکانم ! هەروەکو پیویستە ئیمانو باوەرمان بیی بە ذاتو صیفەتەکانی خواو ، بە مەلائیکەکان ، پیویستە ئیمانو باوەریشمان بیی بەو کتیبانە کە خوای گەورە ناردوونی بو پیغەمبەران. پیویستە باوەرمان بیی بەوەی کە خوای گەورە بە فەضلو رەحمەتی خوی ، لەوکاتەوە ئادەمیزادی دروست کردووە ، هەر لە ئادەمەوە تا ئاخرزەمان ، پیغەمبەرانی رەوانە کردووە بو سەر ئادەمیزاد ،هەتا تەمیو تەعلیمیان بکەنو ، دەستووری عیبادەتو بەندەییو ؛ ئادابی ژیانی دنیا بەخوشییو ، سەربەرزیی پاشەروژیان پیشان بدەن ، ئەووەلی ئەو پیغەمبەرانە حەزرەتی ئادەمو ، ئاخریان حەزرەتی محمدە ، کە خاتەمی هەموو پیغەمبەرانەو ، هەریەك لەو پیغەمبەرانە ، کە فەرمانی تەمیو تەربیەیان پیدراوە ، کتیبیکیان بووە، کە دەستووری خوا بووە بو ئادەمیزادو ، ئەو کتیبانە کەلامی خوا بوونو ، بو ریگە نیشاندان رەوانە کراوونو ، ئادەمیزادو پەری عەلاقەیان بەوکتیبانەوە نەبووەو ، هەرشتی کە خیلافی حەق بی لەوکتیبانا نەبووە ، پاك بوون لە بەشی شەیتانو ئەرواحی ناپاك . ئەوکتیبانە ، بەهوی حەزرەتی جوبرەئیلی

ئەمینەوە هاتوونەتە خــوار بە پاریزراوی لەهەموو عەیبیكو ، ئاخری ئەو كتیبانە ناوی (قورئان)ە ، كە رەوانە كراوە بو حەزرەتی (محمــــد المصطفی) ، صلی الله علیه وسلم •

ژمارەی ئەو كتیبانە، لەسەر فەرموودەی پیغەمەر دروودی خوای لی‌بی ، سەدو چوارە ، دە كتیب لەوانە رەوانە كراوون بو حەزرەتـــی (آدم)و ، پەنجا بو حەزرەتی ( شیث )و ، سیی بو حەزرەتی ( ادریس)و، دە بو حەزرەتی (ابراهیمی خلیل) ، ئەم سەدە ناویان (صحــف) بووە ، (تەورات) بو حەزرەتی (موســا) ، (زبــور) بو حەزرەتــی (داوود) (ئینجیل) بو حەزرەتی (عیسا) ، (قورئان) بو حەزرەتی (محمد المصطفی) هاتوونەتەخوار ، درورودی خوایان لی بی •

هەریەكیك لەم كتیبانە ، كە نازل بووە ، رەفتاری پی‌كراوە هەتا لەپاش ئەو كتیبیكی‌تر هاتووە بو سەر پیغەمەریكی‌تر ، ئەوســا هــەر حوكمی موخالیفی حوكمی ئەم كتیبە دوایی‌یە بووە بە (منسوخ) تەماشا كراوە ، واتە : حوكمی نەماوە ، هەروا بەم جورە ، هەتا قورئانی پیروز هاتووە بو سەر پیغەمەر ، درورودی خوای لی‌بی ، بەوجورە كە وتمان قورئانیش كتیبەكانی پیشووی نەسخ كردوەتــەوە ، بەلام ئەبــی ئەوە بزانین كە هەموو ئەو كتیبانە چەند حوكمیكیان تیا بووە قابیلی ئــەوە نین تیك‌بچن ، ئەو حوكمانە بریتین لە ئوسولی ئایین ، وەك ئیمان بــە خواو ، بەمەلائیكەو ، بە پیغەمــەرانو ، بە كەلامــی خــوا لەگــەل پیغەمەرانا ، هەروەها ئیمان بە روژی قیامــەتو ، پاداشی كردەوەو ، ئیمان بە قەزاو قەدەر ، واتە ئیمان بەوە كە هەرچی پەیدا بووەو ، پەیدا ئەبی ، هەمووی لە عیلمی خوادا بووەو ، بە ئیرادەو خواستی ئەوو ، بە قودرەتو تواناو دروست‌كردنی ئــەو پەیدا بوون • ئەمانە كــە وتمان هەرگیز تیك‌ناچن‌و نەسخ ناكرینەوە •

لەسەر ئەم بناغەیە قورئان ، كە لەپاش هەموو ئەو كتیبانە هاتووە، هەر ئەو فەرمان رەوایەو ، هەتا روژی قیامەت حوكمی دەوام ئــەكات ، چونكە لەپاش پیغەمەری ئیمە ، كــە حەزرەتــی (محمد المصطفی)یە ،

پێغەمبەری‌تر نابی‌و ، لەپاش قورئانی پیروز کەلامی‌تر نازل نابیت ،لەبەر ئەمەیە کە قورئان تا قیامەت ئەمینی‌و ، هەر یاسـایی کـە سـوودی دین‌و دنیای ئادەمیزادی تیابی هەمووی لـە قورئاندا هەیەو ، لی‌ی وەرئەگیری ، یانی ئەو حوکمانە یـا بەتایبەتی قورئان بەیانی کردوون ، یا حەوالەی پێغەمبەر کراون ، کە پێویستە بەگوی‌ی بکری‌و ، هەرچی ئەمر ئەکات بکری‌و ، هەرچی مەنع ئەکات نەکری ● هەروەها لە قورئانا هەیە : ئەو ریگەی کە ریگەی هەموو موسولمانانە ریگەیێکی راستە ، کـــەوابی (اجماع)و یەکگرتنی عالمانی دین لە هەر حوکمیکی دینی‌دا پێویستــە پەیـرەوی‌ی بکــری‌و ، لـــە قورئانــا هەیــە کـــە عیبــرەت‌و قیاســـی ئیشیـــك لەســـەر ئیشیکـــی‌ترو ، حوکمی لەســـــەر حوکمیکـــــی‌تر ، لـــــە ئادابـــــی موسولمانـــــانو عاقلانە ، کەوابی قیاس کردن دروستە ● لە قورئانــا هەیە پیاوی شتی نەزانی پێویستە بروا بولای ئەهلی ذیکــرو ئەوانە کــە ئەحکامی دین ئەزانن ، هەتا پرسیاریان لی‌بکەن ، کەواتە داوای فتــوا لــە زانایانو ، فتوادانی زانایان شتیکی حەقەو ، لە قورئانا هەیە کەئەهلی علم‌و دین ئەتوانن (استنباط) بکەن ، واتە :ـ ئەتوانن ، بە هیزی ئاگاداری لـــە ئەحکامی قورئانو حەدیث ،هەر حوکمیك بە ئاشکرا بەیان نەکـرابی ، خویان بیدوزنەوەو ، بە موسولمانانی فیر بکەن ، وە لە قورئانا هەیە کە ئومەتی پێغەمبەر ، دروودی خوای لی بی ، ئەبی ئەهلی بەصیـرەت‌و زانایی‌و عەقل‌و ئیستیدلال‌بن ، لەبەرئەوە پێویستە لەم ئومەتەدا زانای وەها هەبی کە بتوانــی بە دەلیل ئیسباتی هەنــدی حوکمی وەها بکات کــە لە قورئانو حەدیثا بەتایبەتی‌ی نەنووســراونو نــەوتراون ●● هەروەها ، لە قورئانی پیروزدا هەیە کە ئایینی ئیسلام ئایینی ئاسانی‌و ، ریگە پاككردنەوەو قازانجی ئادەمیزادە ● لەمەوە وەرئەگیری کە لەکاتی پێویست‌و لەکاتی ناچاریدا تەماشــای عەفو ئەکریت‌و ، لــە زەحمەت‌و باری گران موسولمانان لائەدرین‌و ، لـەســەر قازانجــی گشتـــی‌ی موسولمانان ، دەستوورو یاسا ، بەپی‌ی روژ دائەنریت ●

وه وینەی ئەم شتانە،کە باسمان کردن،لە حەدیثی پیروزیشا هەیە، بەمجورە لە ئایینی ئیسلامدا ریگای (ئیجماع) هەیەو ، یەکگرتنی قسەی زانایانو ، باوەر پی‌کردنیو ، رەفتار پی‌کردنی هەیە، هەروەها ریگای (ئیجتیهاد) هەیە ، واتە : زانایانی گەورە تی‌بکوشن بو دوزینەوەی ئەحکامی دین ، وە ماوەی (قیاس) هەیە ، واتە : زانینی حوکمی شتیك بەهوی شتیکی ترەوە کە حوکمی دیار بی ، هەروەها مەیدانی (ئیستیدلال) هەیە ، یانی دەلیل هینانەوەی زانایانی موجتەهیدو گەورە بو وەرگرتنی ئەحکامی دین لە ئایەتو حەدیثو لیکولینەوەیانو،لەسەر ئەم ئەساسە قورئانی پیروز هەرچی قازانجو سوودی تیا هەبی بو دینو دنیای موسولمانان تیایا هەیە •

× × ×

الحمد لله • ثم الحمد لله • الحمد لله المنعم المنان ، المنزل للصحف على الرسل ، ومنزل التوراة والزبور والانجيل والقرآن • احمده واشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ، وان سيدنا محمدا عبده ورسوله الهادي بفصل الخطاب واكمل البيان • اللهم صل على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه واتباعه باحسان الى يوم الدين ، خصوصا على سادة ديننا ذوي القدر العلي والفخر الجلي ابي بكر وعمر وعثمان وعلي ، وعلى الحسن والحسين وحمزة والعباس ، وعلى الستة الباقية من العشرة المبشرة رضوان الله تعالى عليهم اجمعين •

اوصيكم ايها الناس ! ونفسي اولا بتقوى الله وطاعته فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون •• ايها المؤمنون ! ان من اركان الايمان الايمان بالكتب المنزلة من الله الديان على عباده المرسلين ، من لدن آدم الى سيدنا محمد خاتم الانبياء والمرسل الى الانس والجان ، وقد كانت الاوائل والاواخر متفقة في اصول الشرائع والاديان ، وانما اختلفت في الاحكام الفرعية بحسب تطور الدهور ومقتضيات العصر والاوان ، وتلك الكتب المنزلة تسمى ، في عرف القرآن ، بالصحف ، قال تعالى :

ئەوەیە کە ئینسان لە کەرەمی خوا خوی نائومید نەکاو دەرگای رەحمەت بە خەیالات لەسەرخوی دانەخات،وە هەروەکو گوناح‌کردن خراپە بەدگومانیش بەرامبەر بەخوا گوناحە ، بەلکو نائومیدبوون لە عەفوو کەرەمی خوا ئینسان کافر ئەکات ، هەروەکو پالدانەوەو بی‌ترسی لە عەزابی خوا ئینسان کافر ئەکات ، پەنا بەخوا . هەروەها مەبەس ئەوەیە ئینسان هەرکاتی بە بی‌شوعورو بە هیرشی نەفس گوناحیکی کرد پیویستە زوو بگەریتەوە بو لای خواو لەوگوناحە پەشیمان بیتەوە هەتا خوا عەفوی بکات . خوای گەورە لە قورئانا فەرموویەتی : خوا چی‌ئەکا لە سزادانی ئیوە ئەگەر ئیوە ئیمان‌و باوەرتان بەخوای خوتان بی‌و سوپاسی نیعمەتی خوا بکەن‌و بەپی‌ی ئەولیعمەتانە کە پیتان ئەدا ئیوەش سوپاسی خوا بکەن‌و بەگویری تەقازای نیعمەتەکانی بجولینەوە ؟ . وە لە ئایەتیکا ئەفەرموی: ئەی ئەوبەندانەی کە زیادەرەویتان کردووە لەسەر نەفسی خوتان‌و گوناح‌و تاوانتان کردووە نائومید مەبن لە عەفوو رەحمەتی خوا ، خوای بەرەحم گوناحەکانتان ئەبەخشی بەتەواوی مادام ئیوە ئیمانتان هەبی بە خوا . وە لە قورئانا ئەفەرمویت : ئەی‌موسولمانینە ! بە پەلە خوتان بگەیننە ئەو بەهەشتەی کە پانایی‌یەکەی بەقەد عەرزو ئاسمانەو ئامادە کراوە بو ئەوانەی لەخوا ئەترسن‌و لەسەر ئەمرو نەهیی ئەو رەفتار ئەکەن ، ئەوانەی کە مالی خویان صەرف ئەکەن بو داماوان لەکاتی خوشی‌و ناخوشی‌دا ، ئەوانەی کە رقی خویان ئەخونەوەو چاوپوشی ئەکەن لە تاوانی تاوان‌بار . خوائەم‌جورە ئینسانە خاوەن‌چاکانەی خوش ئەوی ، هەروەها ئەم‌بەهەشتە بو ئەوکەسانەیە کە ئەگەر لەسەر ئارەزووی نەفس گوناحیکی خراپیان کرد یا زولمیان لە خویان کرد زوو بیر بکەنەوە لە زورداری‌و کەریمی‌و تاوان‌بەخشی خواو داوای عەفوی گوناحەکانیان بکەن لە خوا ، بی‌گومان حەقیانە داوای عەفو بکەن لە خوا چونکە بیجگە زاتی خوا کەس نی‌یە تاوان ببەخشی . وە بو ئەوانەیە کە لەسەر تاوان کردن دەوام ناکەن ، وە لەگەل ئەوەشدا

ئەزانن ئیشەکەیان تاوانەو تەوبە واجبەو خوا تاوانبەخشە ، ئەمجورە کەسانە جەزایان عەفوو رەزای خواو بەهەشتیکە کە لەناوبەینـــــی دارەکانیا جوگەی ئاو ئەروا ، وە بەئەبەدی تیایا ئەمیننەوە • ئــەمــە ئەجریکی گەورەو باشە بو ئەوموسولمانانە •

براکانم ! روژیك حەزرەت ، صلی الله علیه وســـلم ، لــەگەل هاوریکانیا لە شوینیکا بوون ، لەویدا ژنی پەیدا بوو بەگەرم ئەگەرا بە شوینی منالیکی ونبوویا ، وە بەریکەوت لە نزیکــی ئــەوانەوە منـــالەکەی دوزی‌یەوەو دەستی کردە ملی‌و لــە خوشـــەویستی‌و میهرەبانی‌دا گریا بەسەریا • حەزرەت ، صلی اللــه علیــه وسلــم ، فەرمووی بەیارانی : ئاگاتان لی‌بوو ئەوژنە چی‌کرد ؟ وە حالی چــون بوو بو ئەومنالەی ؟ عەرزیان کرد : بەلی • ئەویش فەرمووی: قەسەم بەخوا رەحمی خوای گەورە بو ئیوە زورترە لە رەحمی ئەوژنە بــو منالـــــەکـــەی •

برا خوشەویستەکانم !مەبەس لەمقسانە ئەوەیە پیویستە ئینسان هەتا بتوانی خوی لە گوناح بپاریزی ، وە ئەگەر هەر تووشی بــوو لەسەر ئەوگوناحە دەوام نەکاو دەس‌بەردار بی‌و روو بکاتە خــواو تەوبە بکاو پەشیمان بیتەوە ، وە ئەگەر حەقیکــی یەکیکــی لابوو بیداتەوەو گەردنی خوی ئازاد بکا لە حەقی مەخلووقات بەهـــوی ئازادکردنی ئەوانەوە ، وە هەمیشە گومانی بەخوای خوی باش بی ، چونکە خوای گەورە ئەفەرموی : من وام لەگەل گومانو خەیالــی عەبدی خوم بە من ، چون عەقیدەی هەبی بە من وەهـــا موعامەلەی لەگەل ئەکەم • خوای گەورە دلمان راکیشی بو لای خوی‌و ئەنجامما‌ن بــەخیر بگیریـــت •

× × ×

الحمدلله • ثم الحمدلله • الحمدلله الذی احــب التائبیـــن ، وفتح ابواب کرمه علی العباد الراجعین الیه الایبین • احمده واشهــد ان لااله الا الله وحده لاشریك له وان سیدنا محمدا عبده ورسولــه

الى الجن والانس اجمعين • اللهم صل وسلم على سـيدنا محمد وعلى آله واصحابه واتباعه الى يوم الدين ، خصوصا على سادة ديننا ذوى القدر العلى والفخر الجلى ابى بكر وعمر وعثمان وعلي وعلى الحسن والحسين وحمزة والعباس وعلى الستة الباقيةمن العشرة المبشرة رضى الله تعالـى عنهـم اجمعيـن •

اوصيكم ايها الناس ! ونفسى اولا ، بتقوى الله وطاعته فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون • ايها المؤمنون ! قال الله تعالى: قل ياعبادى الذين اسرفوا على انفسهم لا تقنطوا من رحمـة الله ، ان الله يغفر الذنوب جميعا ، انه هو الغفور الرحيم • دلت هذه الايـة الكريمة على ان الانسان ، وان كان عاصيا قاسيا مذنبا بالغا ذنبـه مابلغ فانه ان تاب عن ذنوبه واناب اليه فانه تعالى يتوب عليه ويغفـر ذنوبه بفضله ورحمته • فالواجب عليكم ايها المسلمون الذين عصـوا ربهم ان تتوبوا اليه وان لاتسدوا هذا الباب الواسع عليكـم ، وان لاتيأسوا من رحمة الله انه لاييأس من روح الله الا القوم الخاسرون• اعوذ بالله من الشيطان الرجيم • وانى لغفار لمن تاب وامن وعمل عملا صالحا ثم اهتدى •• نبهنى الله واياكم من نومة الغافلين ، وحشرنى واياكم تحت لواء سيد المرسلين • آمين •

## خوتبەی چوارەم بومانگي شـــەعبان

**برا خوشەویستەکانم !**

هەموودینیکی ئاسمانی بەتایبەتی دینی موقەدەسی ئیسلام داوا ئەکات لە ئادەمیزاد کە خویانو دلیان لە شتی پەسـتو (رذیله) پاك بکەنەوە ، وە ، بە رەوشتی بەرزو (فضیله) ظاهیرو دلیان جـوانو رازاوە بکەن.جا لەبەرئەوەی لابردنی صیفەتی خراپە بەئەهەمیەت‌ترە لە وەرگرتنی صیفەتی چاکە دینی ئیسلام زور زور مەنعـی ئینسانـی کردووە لە صیفەتی خراپ ، چونکـە هەتا ئینسـان لە رەزیلـە پاك

نەبیتەوە قابیل نی‌یە بە تەواوی صیفەتی چاکە لەدلیا جیگیـر ببـی •
وە خراپە بەکورتی دوو بەشە • ( یەکەم ) : خراپەی پەنهانە کە صیفەتی
نەفسی ئینسانە وەکو کوفرو نیفاق‌و دووروویی‌و بەدگومانـــی‌و
حەســوودی‌و کینــەو رقــەبەری • (دووەم) : بەدەرەوەیە وەکــو
داوین‌پیسی‌و دەس‌پیسی‌و زمان‌پیسی ، وە ئەمانە هەریەکی زور مەنع
کراون لە ئینسان وە پیغەمەران‌و پیاوچاکان‌و زانایان لە دنیـــادا
هەمیشە تیکوشاون بو چارکردنیان • وە ئەوەی لە هەموو گونـــاحی
رەش‌ترە کوفرە چ کافریەتی ئاشکراو چ کافریەتی نیفاق‌و پەنامەکی•یانی:
لە دلا کافربیت‌و بەئاشکرا خوی بەموسلمان دەربری • ئینسانی کافر
ئاخرشەرو چارەرەشە وە ئەنجامی عەزابی نەبراوەی پاشەروژە ، خوا
پەنامان بدا • وە پاش کوفر صیفەتی (تکبر) • یانی : خو بەگــەورە
زانـین‌و خو بەچـــاك زانـین لــە نــاو عالەمـــا • ئەمجا ( نفاق )
لە دنیـادا کە دووروویی‌یە لەگەل خەلکـــا • واتە : بەئاشـــکرا
خوی بەدوستیان پیشان بداو لە واقیعا بە ناحەق دوژمنیـــان بی •
ئەمە صیفەتیکی زور پەستەو دوورە لە ئینسانی بەویجدان چونکــە
درویەو غەشەو خیانەتە، تەنانەت هەندی لە عالمان ئەمجورە حالەیان لا
خراپ‌ترو ناشیرین‌ترە لــە دوژمنایەتی ئاشکرا • وە پاش ئەمانە (ریا)
لەطاعەت‌و عیبادەتا • وە لەســـەر فەرمــوودەی حەدیــث (ریا) بە
(شرکی‌اصغر) ، یانی : کوفری بچووك ، ئەناسری • وە هەندی لـــە
عالمان فەرموویانە هەرعیبادەتیـك‌و هەرخیـرو خیراتی بــە (ریاو)
بەرچاوی بکری قوبول نی‌یەو بەتالەو ئەبیتــە هوی تاوان‌و گــوناه
لەسەر خاوەنەکەی• خوای گەورە ئەفەرمویت :دینی ساغ بو خوایەو
خوا دینی ساغ وەرئەگری ، وە خوا شتی دەغەلی ناوی • پاش‌ئەمانە
بەدگومانی‌و ظەنی خراپ بردن بەخەلك بەبی دەلیلیکی شــەرعی زور
ناپەسەندە،وە خوای گەورە لە قورئانا فەرموویەتی: ئەی‌موسولمانینە!
خوتان بپاریزن لە گەلی گومان ، چونکە هەندی گومان بەخەلـــك
گوناح‌و تاوانە • وە بەراستی ئەم بەدگومانی‌یە زور شتی خراپی لــی

پەیدا ئەبی٠ (یەکەم) :خیلافی رەزای خوایەو خوا لە خاوەن گومانەکە
عاجز ئەبیتو غەزەبی لی ئەگری ٠ (دووەم) : خاوەنی ئەم صیفەتە لـە
بارەو سوودی ئەوکەسە بی بەش ئەبی ٠ (سیەەم) :خاوەنی ئەم صیفەتە
زور جار وا ریك ئەکەوی ئەوگومانەی خوی دەرئەبری و بوختـان
ئەکات بو کابراو باسی خراپی ئەکا ٠ (چوارەم) : بەهوی ئەوەی کە
ئەم شەخسە باسی خراپی شەخسەکـەی تر ئەکات خـەلـك دوور
ئەکەویتەوە لەوکەسەو لەوانەیە بی بەش بن لـــە بارەو ســـوودی
ئەوکەسە ، ئەگەر یەکیکی خاوەن جیگـەو ریگـە بوو ٠ (پینجەم) :
وائەبی شەخسەکەی تریش کە لە وەزعی ئەم تی گەیشت دەس ئەکات بە
خراپەوتنی ئەم و هەردوولایان خویان و خەلکیش تاوانبار ئەکەن بـە
ناحەق و ناگوناە ٠ پاش ئەمانە صیفـەتی رق گرتـن و غـەزەب زور
گوناحیکی خراپ و بەدەنجامە ٠ زورکەسی وەها بوون کە بەهـوی
رقەوە خویان کافر کردووە ، یا خویان کوشتـووە ، یا ژنیان تـەلاق
داوە ، یا دوستو برادەریان رەنجاندووە ، یا دلی پیاوی بەنرخیـان
ئازار داوە ، وە بەهوی ئەم صیفەتەوە ئەوشەخســـە خوی و خیزان و
دوستی خوی فەوتاندووە٠ وە ئەنجامی خراپی رق گرتن لە حیسـاب
نایەت ، بویە شەخسی هاتە خزمەتی پیغەمبەر : صلی الله علیه وسلم،
وە عەرزی کرد : ئاموژگاریم بکە ، ئەویش فەرمووی : رق مـەگرە،
وە تا سی جار کابرا قسەکەی تەکرار کـردەوەو حـەزرەت لە وەلاما
فەرمووی : رق مەگرە ٠ وە فەرموویەتی پالەوان ئەوکەسە نییە کـە
بە زور خەلك بدا بەزەوی یا بەلکو ئەوکەسەیە کە لەکاتی رق و غەزەبا
خوی بگری و نەفسی خوی دابمرکینی ٠ وە پاش ئەمانە صیفەتـــی
حەسوودی یە کە بریتی یە لەوەی ئینسان حـەزبکا نان و نیعمـەت یا
شان و شـەوکەتی برای موسولمانی بفەوتی ٠ئەم صیفەتە ئینسان نزیك
ئەکاتەوە لە کافربوون ، وە لە حەقیقەتا رەخنەگرتنە لـــە کاری خواو
نارەزایی یە بە ئیشی ئەو !! وە لە حەدیثا ئەفەرمویت : صیفەتـــی
حەسوودی حەسەناتی ئینسان ئەفەوتینی وەك چون ئاگـر پـووش

ئـــەسووتینـــــی •

براکانم ! ئەم‌صیفەتانە کە باسـمان کردن هەموو نەخوشینی دلی ئینسانن ، وە نەخوشی دل بەم‌جورانە گەلی خراپ‌ترە لە نەخوشینی لەش چونکە ئەوپەری پایەی نەخوشی لەش ئەوەیە کە ئینســـــان ئەمرنی‌و مردن شتیکی واجبە بو هەمووکەس ، بەلام ئەم‌صیفەتانــە چەن زیانیان لی پەیدا ئەبی • (یەکەم) :گەلی‌جار ئەبنە هوی نەخوشی بەدەن‌و ئینسـان بــە بــەدبەختــی ئــەمرنــن • (دووەم) : خاوەنی ئەم‌صیفەتانە هەمیشە ئەوندە دلی نارەحەتە هەرگیز لەزەت‌و خوشی لە ژیانی خوی نابینی • (سیهەم) : گەلی‌جار ئەم‌صیفەتانە ئەبنە هــوی کافربوون‌و نائومیدبوون لە رەحمەتی خوا • (چوارەم) ئەوکەسانــە کە بەم‌صیفەتانە مەشهوور ئەبن لەناوعالــەما ســـووک‌و بی‌قیمــەت تەماشایان ئەکری • (پینجەم)ئەم‌دەردانە وەها دلی ئینسان نەخــوش ئەخەن قابلی چارکردن نابی بەتایبەتی رق‌و کینەو حەســەدو عــەناد وائەکەن لە ئینسان کە هەرگیز گوی‌ناگری لە ئاموژگاری‌و قســەی راست ، کەواتە زور پیویستە هەول‌بدەین بەهوی یادی خواو بـــە رەفیقی پیاوی باش‌و بەهوی ئاموژگاری پیاوی ژیری خیرخواو بــە وردبوونەوەی خومان چاری ئەم‌صیفەتانە بکەین بەلکــو بگەینــــە ســـــەعادەت‌و بەختیــاری •

× × ×

الحمدلله • ثم الحمدلله • الحمدلله الذى امر بتزكية النفـــس عن الرذائل وتحليتها حسب المستطاع بالفضائل • احمده واشهد ان لا اله الا الله وحده لاشريك له وان سيدنا محمدا عبده ورسوله اكمــل الاواخر والاوائل • اللهم صل على سيدنا محمد وعلى اله وصحبـــه واتباعه الابرار الاماثل الى يوم الدين ، خصوصا على سادة دينا ذوى القدر العلى والفخر الجلى ابى بكر وعمر وعثمان وعلي وعلى الحسن والحسين والحمزة والعباس وعلى الستة الباقية من العشرة المبشرة • رضى الله تعالى عنهـــم اجمعيــن •

اوصيكم ايها الناس ! ونفسي اولا بتقوى الله وطاعته فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون • ايها المؤمنون ! قال الله سبحانه وتعالى قد افلح من زكيها وقد خاب من دسيها • وقال : ان النفس لامارة بالسوء•دلت الايتان الكريمتان على ان النفس هي الداعية الى العقائد السيئة والاعمال البذيئة والاخلاق الرديئة ، وان المفلح هو الذي غلب عليها وكبح جماحها ووجهها الى طريق رشادها • وان الخائب الخاسر هو الذي غلبت النفس عليه وساقته الى ماتهوى حسب هواها وفسادها• فاتنبهوا لهذه الحقيقة وامشوا على طريق الحق والدين كي تنجوا من النار وتدخلوا الجنة التي اعدت للمتقين الابرار • اعوذ بالله من الشيطان الرجيم • واما من خاف مقام ربه ونهى النفس عن الهوى فان الجنة هي المأوى • نبهني الله واياكم من نومة الغافلين ، وحشرني واياكم تحت لواء سيد المرسلين • آمين •

## خوتبەی پینجەم بو مانگی شەعبان

**برا خوشەویستەکانم !**

لەمەوپیش باسی هەندی صیفەتی خراپی دەروونمان کرد • وە ئیستە باسی هەندی لە کردەوەی خراپی وا ئەکەین کە هەرچەن بناغەکەیان خراپی دلو دەروونە بەلام دیارینو بە ئەندامەکانی دەرەوە ئەکرین • ( یەکەم ) کوشتنی نەفسیکی بیتاوانە بەناحەق • ئەمکردەوەیە لەپاش کافری لە هەمووگوناحیکی دیاری گەورەترە • وە حەدی لە دنیادا ئەوەیە کە قاتیل بکوژریتەوە لە قیصاصا ، وەئەگەر شەخسی قاتیل ئەوقەتلە بەحەلال بزانی پیی کافر ئەبی • (دووەم) تەعەروضکردنو دەسبردنە بو ناموسی خەلك • ئەمگوناهە ئەوەندە گەورەو نابارە تولەکەی لە دینی ئیسلاما ئەوەیە کە شەخسی تاوانبار بەردەباران بکری ، وە ئەگەر هەردوولایان عازەب بوون تولەیان صەددارەو سالیك شاربەدەرکردن بو ولاتیکی دوور • ( سییەم ) دەسبردن بەخیانەتو ناحەق بو مالی موسولمانان • جا ئەمە ئەگەر بە

جەردەیی‌و ری‌گری بی جەزاکەی ئەوەیە راست‌و چەپی تاوانبار ببرری‌و بکری بەدارا ، وە ئەگەر بەدزیەتی بی جەزای دەس‌برینی تاوانبارە مادام حەقی شەرعی‌یان نەبی لەومالەدا سا یا بە راستی یا بە هوی شوبهەوە •
وە ئەگەر بەغەصب‌و داگیرکردن بی ئەوە لە دنیادا بــە تاوانیکی زل دائەنری ، وە بە وتەی حەدیثی شەریف هەرکەس بستی عەرزی یەکیك داگیر بکات لە قیامەتا ئەکری بە تەوق‌و ئەکریتە ملی ئەوداگیرکەرە•وە گەلی لە ئیمامانی دین فەرموویانە هەرنوچی لەوعەرزە داگیرکراوەدا بکریت بەبی‌ئیزنی خاوەنەکەی بەتالەو واجبە لەپاشا بەقەزا بکریتەوە!•
وە هەرکەس لەپیناوی پاراستنی ناموس‌و مالی خویا بکوژری ئەوە پایەی شەهیدی هەیە • وە ئەگەر یەکیك لەکاتی دیفـــاع لەنەفس‌و ناموس‌و مالا کەسیکی کوشت ئەوە بە قاتیل دانانری • وە بەتایەتی هەرشتی کە درابیتە دەستی ئینسانی وە کرابی بە ئەمیندار لەســەری مادام خەیانەتی تیابکات زور بەتاوانبارو غەشاش دائـــــەنری ، وە حەزرەت ، صلی اللّٰهعلیه وسلم ، فەرموویەتی : هەرکەس غەش بکـــا لە ئیمە نی‌یە • واتە : لە ژمارەی ئوممەتی پاکی ئیسلاما ناژمیرری • وە ئەوگوناحانە بە زمان ئەکرین زورن • ( یەکەم ) ئەوەیە کــــە ئینسان بەنیازی خەلك‌گوروفتارکردن لای پیاوی دەس‌رویشتوا ناوی یەکی بەخراپە بباو گیرودەی بکات یا نەفسی یا ناموسی یا مالی تووشی زیان بکات •ئەمە یەکەم‌گوناحی زمانە پاش کوفرکردن وە زور گوناحیکی زلە ، وە حەزرەت، صلی اللّٰه علیه وسلم ، فەرموویەتی : قسەی (ساعی)و ئەوکەسەی کە لای دەس‌رویشتوو یەکی بەدناو ئەکا سی کـــــەس ئەفەوتینی‌و گیرودەیان ئەکا خوی‌و کابرای دەس‌رویشتوو لە قیامەتا ، وە کابرای ناوبراویش لە دنیادا ، وە لەوانەیە شەخسی زیان‌لی‌کەوتووش زیاد لە حەقی خوی زیان لەو بدات‌و وەکو ئەوان تووشی تـــاوان‌و جەزای قیامەت ببی • ( دووەم ) بوختان‌کردنە بو ئینسانی پـــــاك پیاو بی یا ژن • وە هەرکەسی بوختان بو ناموسی یەکی بکا ئەگەر بە چوار شاهید ئیسباتی نەکا واجبە هەشتا داری لی بدری ، وە بـــە

فاسق ئەناسری‌و شایەتی قوبوول ناکری مەگەر تەوبە بکاو هەتا ماوەی سالیك نەگەریتەوە بو سەر گوناح ، وە ئەگەر بوختانەکەی لـــە رووبەکی‌ترەوە بوو ئەوەش هەر گوناحیکی گەورەیە وە بـــەپی‌ی چونی‌یەتی بوختانەکەیە • (سیهەم) فیتنەپی‌کردن‌و بەین‌تیکدانە • لـە حەدیثا پیغەمبەر ئەفەرموی : ئەم‌صیفەتە وەك چون گوێزان ســـەر ئەتاشی وەها دینی ئەوکەسە ئەتاشی‌و لە دین بی‌بەشی ئەکات ، وە ئەونەخوشی‌یە کە تووشی کومەلی ئادەمیزاد ئەبی بەهوی فیتنەپی‌یەوە لە هەمووزیانی نابارترو لە هەموونەخوشی‌یەك کوشندەترەو زور پیویستە هوشیارانی ئادەمیزاد ئاگایان لەم‌نەخوشینە بی • (چوارەم) غەیبەتە • یانی : باس‌کردنی خەلك بە خراپی لە پاش‌ملە بـــەجوری شەخسی ناوبراو حەزی پی نەکا • ئەم‌گوناحە لەناوخەلکا سووکەو لە دەستووری ئیسلاما گەلی بەشی بە گوناحی گەورە دائەنری ، وە خوای گەورە لە قورئانا وەهای داناوە کە ئینسان گوشتی برای خوی بخوات بە مردووی ، وە ئەم‌تەشبیهە لەبەر سی شتە • یەکەم : چونکە شەخسی ناوبراو ، لەبەرئەوەی حازر نی‌یە تا دیفاع لە خوی بکـــا ، وەکو مردوو وایە • دووەم : چونکە هەروەکو طەبیعەتی خاوین حەز ناکا لە خواردنی گوشتی مردوو طەبیعەتی ئینسانی خاوینیش حـــەز ناکات لەم‌غەیبەتە • سیهەم : وەکو بە دەس‌دریژی‌کردن لە مـــردوو خزم‌و کەس‌وکاری مردووەکە دل‌شکست ئەبن بە هوی ئەم‌غەیبەتەوە عەلاقەداری ئەوکەسە دلیان نارەحەت ئەبیت‌و ئەبی بە هوی تیك‌چوونی بەینیان • ( پینجەم ) لەوگوناحانە کە بە زمان ئەکرین دروکردنە• درو بیجگەلەوە کە گوناحەو چەن بەلاو مەینەتی لی پەیدا ئەبی لـــە دنیاداو ئەبی بە هوی ئازارو عەزابی قیامەت هەروەها لە دنیایشـــا شەخسە دروزنەکە سووك‌و بی‌نرخ ئەکات ، بویە واجبە ئینسان خوی لەم‌صیفەتە پەستە دوور بخاتەوە•وە ئەگەر بە راستی ری مردن بگری چاك‌ترە لەوەی بە درو قەسری وەربگری • وە حەزرەت، صلی‌الله علیه وسلم، ئەفەرموی : لەوانەیە ئینسان گەلی گوناح بکا ، بەلام موسولمان

دروو تاكا • ( شەشەم ) جنێودانو ئابڕووبردنی خەڵکە • ئەم‌صیفەتە خووی ئینسان نی‌یە • حەزرەت ، صلی الله علیه وسلم ، ئەفەرموی : دوو کەس جنێو بە یەکتر بدەن وەکو دوو شەیتانن کە بەرامبەر بەیەك بە درو ئابرووی یەکتر ئەبەن •

براکانم ! ئەم‌صیفەتانە کــــە باسم‌کردن دوژمنی ســـــعادەتی ئادەمیزادن ، وە هوی تاریکی دنیاو قیامەتن ، وە خوای گــەورە بویە عەقلی پی‌داوین‌و پیغەمەرانی ناردووە بو ئاموژگاریمان هەتا دڵو چاوی خومان بکەین بە چرا بو رووناکردنەوەی ریـــگای ژیانی دنیامانو مسوگەرکردنی بەختیاری‌و حەسانەوەی ژیانی دوایمان •

× × ×

الحمد لله • ثم الحمد لله • الحمد لله الذي يحب التوابين ويحب المتطهرين • احمده واشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له وان سيدنا محمدا عبده ورسوله • اللهم صل على سيدنا محمد وعلى آله واصحابه واتباعه باحسان الى يوم الدين ، خصوصا على سادة ديننا ذوى القدر العلي والفخر الجلي ابي بكر وعمر وعثمان وعلي وعلى الحســـن والحسين وحمزة والعباس وعلى الستة الباقية من العشرة المبشرة • رضي الله تعالى عنهم اجمعين •

أوصيكم ايها الناس ! ونفسي اولا بتقوى الله وطاعته فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون • ايها المؤمنون! قال الله تعالى : لقد كان لكم في رسول الله اسوة حسنة • دلت هذه الاية الشريفة على ان المسلم يجب‌ان يكون تابعا لرسولهفى اقواله وافعاله وخصاله•ومن خصال النبي ، صلى الله عليه وسلم ، العفة والنزاهة في القلب ، والعزة والكرامة والشهامة فى النفس ، والصدق في الاقوال والاعمال، والامانة وحفظ الغيب والترحم على النساء والرجال وعلى الشيوخ والكهــول والشباب والاطفال • كيف لا ؟ وقد قال عليه الصلاة والسلام ، بعثت لاتمم مكارم الاخلاق • فاقتدوا برسولكم تفوزوا بمأمولكم ، واعلموا

ان من سلك مسلك السعادة لايقع فى مهاوى الابادة ، ومن اوقع نفسه في مخاطر السوء باء بالويل او سيبوء • فعليكم انفسكم ومن يتبـــع رأيكم ، والله حفيظ عليكم•اعوذ بالله من الشيطان الرجيم وما آتاكم الرسول فخذوه وما نهاكم عنه فانتهوا واتقوا الله ان الله شديد العقاب• نبهني الله واياكم من نومة الغافلين ، وحشرني واياكم تحت لواء ســيد المرسلين • آمين •

# خوتبەکانی مانگی رەمەزانی پـیروز

## خوتبەی یەکەم

**برا خوشەویستەکانم !**

وەکو لەمەوپیش باسم کرد بوتان خوای گەورە ئەرکانی ئیسلامی کردووە بەهوی تاقیکردنەوەی ئیخلاص‌و ساغی ئادەمیزاد لە ئیمان‌و باوەرا ، وە بەراستی بەهوی بەجیهینانی ئەم‌ئەرکانی ئیـــسلامەوە دەرئەکەوی کە تا چرادەیەك ئینسان ئیمانی ساغە • وە یەکی لـــە ئەرکانی ئیسلام روژووی مانگی رەمەزانە لە هەموو سالیکدا • خوای گەورە ئەفەرمویت : ئەی ئەوانەی کە ئیمان‌و باوەرتان هەیە بە خواو پیغەمەری خوا ! روژوو فەرز کراوە لەسەر ئیوە وەکو فەرز کراوە لەسەر ئەوانەی کە لەپیش ئیوەدا بوون هەتا بەهوی ئەم‌روژووەوە لە خوا بترسن ••• وە ئەوروژووە فەرز کراوە لەسەرتان لە چـــەن روژیکا کە بریتین لە مانگی رەمەزان ، ئەومانگی رەمەزانە کە گەلی بەنرخەو قورئانی پیروزی تیا نازل کراوە بو سەر فەخری عـــالەم محمد المصطفی ، صلی الله علیه وسلم ، وە قورئان ئەساس‌و بناغەیە بو سەعادەت‌و سەربەرزی ئادەمیزاد لە دنیاو قیامەتا • جا هەرکەس لـــە ئیوە واجبە لەسەری لەومانگەدا بەروژوو بی مەگەر عوزریکی شەرعی هەبی • یەکی لەومەعزورانە ئینسانی پیرە کە بگاتە رادەیەك نەتوانی بەروژوو بی ئەم‌پیرە بوی رەوایە کە روژوو نەگری‌و لەباتی هەموو روژی مشتی لە خواردەمەنی قووت بدا بە داماوان • وە یـــەکی لەومەعزورانە ژنیکە کە لە حەیزا بی یا منالی بووبی‌و هیشتا مودەی نیفاسی تەواو نەبووبی ، ئەم‌دوانە واجبە لەسەریان کە بەروژوو نەبن بەلام پاش ئەوەی کە پاك‌بوونەوە روژووەکەیان بقەزا ئەگیرنەوە • وە لـــەومـــەعزورانەیە ژنی سك‌پر یا ژنی کـــە شیر بدا بەمنـــال ، لەم‌دوو حالەدا ئەگەر بەهوی روژووەکەوە زیان بگا بەومنالەی کە

له سکایه یا بەو منالەی که شیری پی ئەدا واجبه لەسەریان روژوو نەگرنو لەکاتی شینەییدا بەقەزا بیگیرنەوە • یانی : پاش منال‌بوون یا پاش لەشیربرانەوەی منالەکه • وه لەومەعزورانەیه ئینسانی کـــه نەخوش بیو نەتوانی بەئاسانی روژووەکەی بگری • ئـــەمەش بوی دروسته بەروژوو نەبی ، بەلام لەپاش چاك‌بوونەوە روژووەکەی بەقەزا بگیریتەوە • وه لەو خاوەن عوزرانەیه ئینسانی که لەسەر سەفەر بیو سەفەرەکەی دوو مەنزل بی یا زیاتر • ئەمەش بوی دروسته ئەوروژووه نەگریو لەپاش نیشتەجی‌بوون بەقەزا بیگیریتەوە •

برا خوشەویستەکانم ! خوای گەورە له قورئانی پیروزا بریاری‌داوه که روژووی رەمەزان واجبه لەسەر موسولمانان• وه حەزرەت لـــه حەدیثا فەرموویەتی : روژووی رەمەزان واجبه لەسەر هەموو‌ئینسانیکی بالغو عاقل بەوشەرته خالی بی له مانیعو خالی بی لەوشتانه که ئەبنه عوزر له روژوونەگرتنا وەکو بەیانمان کرد • وه روژوو گـــــەلی سوودی هەیه • (یەکەم) : ئەوەیه ئینســـان بەهوی برســـی‌یەتی‌و تینوویەتیوه دلی نوورانی ئەبیو بەرەکەتی خوای بەسەرا ئەرژی • حەزرەت ، صلی الله علیه وسلم ، فەرموویەتی : شەیتان له لەشـــی ئادەمیزادا وەکو خوین هاتوچو ئەکات، کەواته ریگای شەیتان لەخوتان بېەستن بەهوی روژووەوە • وه لەواقیعا ئەگەر ئینسان روژووی گرت لاواز ئەبیو ئارەزووی نەفسی کەم ئەبیو داوای شتی ناکا که خوا حەزی لی نەکا • ( دووەم ) : روژوو بەجوری کارئەکاته ئینسانی بەروژوو که زورباش له وەزعی برســیو تینوو حالی ئـــەبی ، دیاره تا ئینسان خوی توشی دەردی نەبی چاك لیی حالی نابی ، جاکەلـــه ئازاری برسی‌یەتی تیگەیشت دلی بو ئینسانی برسی ئەســـــووتیو بەزەیی پیادیتەوە • ( سیهەم ) : ئادەمیزاد بەهوی خواردنی زورەوە تووشی گەلی ئازار ئەبیو لەوانەیه بەهوی ئەم‌روژووەوە مەعیدەی ئیسراحەت بکاو لەونەخوشی‌یانه کەلە خواردنەوە تووشی بووه رزگار ببی ، وەکو حەزرت ، صلی الله علیه وسلم ، ئەفەرموی : روژوو

بگرن تا ساغ بینەوەو لە ئازار رزگار بین • ( چوارەم ) ئینسانی کە بەروژوو نەبی ماوەی هەموو ئارەزوویەکی نەفسی هەیە ، بەلام بەهوی روژووەوە خوی مەنع ئەکا لە ئارەزووی نەفس لەترسی خواو ئەمەش ئەبیتە هوی مسوگەرکردنی بەهەشت ، وەکو خوا فەرموویەتی : هەرکەس بترسی لە هەیبەتی خوای خوی‌و نەفسی مەنع بکا لە ئارەزوو ئەوە بەهەشت جیگایەتی • ( پینجەم) روژوو ریگایەکی موهیمە بو زال‌بوون بەسەر خەیال‌و وەسوەسەی دڵ‌و زەعیفی ئیمانا چونکە هەموو عیبادەتی مەجالی ئەوەی تیایە بە ( ریا )و بەرچاوینی‌و بو خەلك بکری ، بەلام روژوو خالیص بو خوایە ، چونکە یەکی لە خوا نەترسی ئەتوانی لەپەناوە تا ئەبخواو ئارەزووی نەفسی بەجی‌بینی‌و لەبەرچاوی خەلکیشا بەروژوو بی ، جا مادام ئینسان لە مالی خویاو لە خەلوەتاو لە ترسی خوا بەروژوو بی ئەوە مەعنای وایە بەراستی ئیمان‌و باوەری بە خواو بە جەزای قیامەت هەیەو شایانی رەحمی خوا ئەبی ، وەکو خوا لە حەدیثی قودسی‌یا فەرموویەتی هەموعیبادەتیکی موسولمان بوخویەتی ئیلا روژوو ، چونکە روژوو هەر بو منەو من جەزای ئەدەمەوەو کەس نازانی جەزای روژوو چی‌یە ئیلا خوم نەبی • ( شەشەم ) ئینسان لە دنیادا هەموو کاتی ناتوانی ئارەزووی خوی بەجی‌بینی‌و وا ئەبی لە نان‌و ئاوو رابواردن مەنع ئەکری، جا ئەگەر ئینسان خووبگری بە روژووەوە ئەوا لە روژی رەشا خوی پی‌ئەگیری‌و زور تیك‌ناچی •

براکانم ! ئەمانەی کە باسم کردن چەن نموونەیەك بوون لە حیکمەت‌و قازانجی روژوو ، وە لەحەقیقەتا واجبە ئینسانی موسولمان بکەویتە دوای ئەمری خوا هەرچون‌بی‌و لەبەر هەرچی بی ، چونکە ئیمانی ساغ ئەوەیە بە بی‌قەیدو شەرت بی • خوای گەورە هەموولایەکمان بەدل رام بکا بو بەندەیی‌و طاعەتی راستەقینە •

× × ×

الحمد لله • ثم الحمد لله • الحمد لله الذي كتب الصيام على ملـه

الاسلام ، وجعله وسيلة للسعادة في يوم القيام • احمده واشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له وان سيدنا محمدا عبده ورسوله الهادي للانام • اللهم صل على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه واتباعه البررة الكرام ، وسلم تسليما ، خصوصا على سادة ديننا ذوي القدر العلي والفخر الجلي أبي بكر وعمر وعثمان وعلي وعلى الحسن والحسين وحمزة والعباس وعلى الستة الباقية من العشرة المبشرة رضي الله تعالى عنهم اجمعين •

اوصيكم ايها الناس! ونفسي اولا،بتقوى الله وطاعته فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون • ايها المسلمون ! قال الله تعالى : يا ايها الذين آمنوا كتب عليكم الصيام كما كتب على الذين من قبلكم لعلكم تتقون • هذه الاية الكريمة تنادي بوجوب الصيام وانه شريعة سابقة ومستمرة مدى الايام • كيف لا ؟ وهو مانع الشهوات النفسية ودافع الخواطر النفسانية والمخاطر الشيطانية ، ومرشد الانسان الى معرفة احوال الضعفاء ، ويرغبه في اطعام المساكين رغبة في الفوز بالتجليات الرحمانية ، وهو معيار لخلوص الايمان وصفاء القلب في عبودية الرحمن ، ولذا ورد في الحديث القدسي : كل عمل ابن آدم له الا الصوم فانه لي انا اجزي به • اعوذ بالله من الشيطان الرجيم هذا بيان للناس وهدى وموعظة للمتقين • نبهني الله واياكم من نومة الغافلين؛ وحشرني واياكم تحت لواء سيد المرسلين • آمين

## خوتبەی دووەم بۆ مانگی رەمەزان

**برا خۆشەویستەکانم !**

هەرعیبادەتی کە خوا فەرزی کردووە چەن واجبات و ئادابیکی هەیە ئەگەر بەوشیوەیە بکریت دروستەو ئەگەرنا بی‌سوودە • جا بزانن واجباتی رۆژوو پینج شتە • ( یەکەم ) نی‌یەتە لە هەمووشەویکی رەمەزانا ، یانی : بەدل قەسدی ئەوەی ببی سبەینی بەرۆژوو ئەبی رۆژووی فەرزی رەمەزانی ئەوساڵە • ( دووەم ) : خۆپاراستنە لەوەی

که له ڕوژا شتی بڕواته ناو بوشایی لەشیەوە له دەمەوە یا له لووتەوە یا له گویچکەوە یا له پیش‌و پاشەوە • ( سیهەم ) : خوپاراستنه له جیماع لەگەل ئینزالا بی یا بی‌ئینزال • ( چوارەم ) : خوپاراستنه له ئینزالی مەنی به هەروەسیلەیەك‌بی ، بیجگه له خەوو خـــەیال یــا تەماشاکردن • ( پینجەم ) : خوپاراستنه لەوەی که به عـــەمدی‌و دەسەتقەسد خوی بڕشینیتەوە •

ئەمانه که باسمان کردن واجباتی ڕوژوو بوون•وە سونتەتەکانی ڕوژووی رەمەزان گەلی شتن • ( یەکەم ) : قورئانخوینـــدنه • وە قورئانخویندن ئەگەرچی له هەمووکاتیکا خیـــره بـــەلام لـــەمانگی رەمەزانا گەلی خیری زورتره • (دووەم) ئیعتیکافه • یانی : مانەوەو خوراگرتن له مزگەوتا بەقەسدی عیبادەت • (سیهەم) ئەوەیه کـــه مەغریب داهات زوو وە به پەلـــە بەربانگ بکریتـــەوەو ڕوژووەکـــه بشکینری • چوارەم ) : ئەوەیه که درەنگ پارشیو بکریت ، بەلام وەها نەبی که گومانی ڕوژبوونەوە بکری لەوکاتەدا• (پینجەم) : بەخششه به هەرجوری که له توانادابیت ، چونکه حەزرەت . صلی الله علیـــه وسلم، له مانگی رەمەزانا زور یارمەتی فەقیرو داماوانی داوەو خیری پی‌کردوون • (شەشەم) ئەوەیه لەپاش لادانی خور له ناوەراستـــی ئاسمان سیواك نەکری مەگەر لەبەر عوزری وەکو گورانی تامی دەم• (حەوتەم) سوننەتی تەراویحه له هەمووشەویکی رەمەزانا پاش نویژی عیشا ، ئەمەش سونەتیکی زور گەورەیه • وە ئیمامی بوخـــاری‌و موسلیم ، که له ئیمامه گەورەکانی ریوایەتی حەدیثن ، ریوایەتیـــان کردووه له حەزرەتی عائیشەوە ، خوای لی رازی بی ، که حەزرەت ، صلی الله علیه وسلم ، چەن‌شەوی لەمال هاتەدەرەوە بو مزگـــەوت‌و هەشت رکات نویژی تەراویحی کردو له هەردوو رکاتیکا سەلامـــی ئەدایەوە ، ئیتر له شەوی چوارەما نەهاتەدەرەوە ، که عەرزیان کـــرد بوچی نەهاتووەته دەر فەرمووی : ترسام فەرز بکری لەســـەرتان‌و نەتوانن بەجیی‌بهینن • وە له کتیبی (جمل)ی حاشیەی شەرحـــــی

مەنهەجدا ئەفەرمویت : ئەم‌نوێژی تەراویحی حەزرەتە لە سالـــی دووەمی هجرەتا بووە ، وە ریوایەت ئەکات لە حەزرەتی عائیشەوە کە حەزرەت دوانزە رکاتی‌تری بیجگە لەوهەشت‌رکاتە لەمالەوە کردووە کە ئەکاتە بیست رکات ، وە لە عیبارەتی (فتح الباری) شەرحی بوخاری‌وە دەرئەکەوی کە ئەوهەشت رکاتەی حەزرەت لە مزگەوتا کردوویەتـی نی‌یەتی ئیمامەت‌و جەماعەتی لی نەهینــاوە ، بەلام ئەصحـــابەکان لەپشتیەوە نی‌یەتی جەماعــەتیان هینــاوەو ئەوهەشـــت رکاتــەیان بەجەماعەت کردووەو حەزرەتیش ، صلی الله علیه وسلم ، مەنعـــی نەکردوون لەبەرئەوە جەماعەتەکەی بوو بە سوننەت • وە لە هەنــدی کتیبی گەورەدا باس کراوە کە ئەوسی‌شەوە شـــەوی بیست‌وسی‌و بیست‌وپینج‌و بیست‌وحەوت بوون ، هــەروەها لە هەندی ریوایەتــا دەرئەکەوی کە لە سالی هەشتی هیجرەتا بووە ، یانی : سی سال پیش وەفاتی حەزرەت ، صلی الله علیه وسلم • ئیتر ئەم‌نوێژە بەتەنهـــا هەرکەس ئەیکرد بوخوی هەتا سالیکیش لە خەلافەی حـــەزرەتی (عمر) خوای لی رازی بی • وە لە سالی دووەمی خەلافەتیا ئـــەو بریاری‌دا کە بیست رکاتەکە لە مزگەوتا بەجەماعەت بکـــری ، وە فەرمووی : لەپاش وەفاتی حەزرەت ئیمــە ترســی واجـــب‌بوونی ئەم‌نوێژەمان نەماوە ، وە (أبی ) کوری کەعبی کرد بە ئیمام بو پیاوان‌و سلیمانی کوری ابوحثمە یا ابوحەثمەی کرد بە ئیمامی ژنان ، وە بەعزی ئەلین کە تمیمی دارەمی کرد بە ئیمامی ژنان ، وە ئەصحابەکان هەموو رازی بوون بەم‌کردەوەی حەزرەتی (عمر)ەو کەس ئینکاری نەکــرد، تەنانەت حەزرەتی (عثمان)و حـــەزرەتی (علــي) خوایان‌لی‌رازی‌بی ، دوعای خیریان کرد بو حەزرەتی (عمر ) لەسەر ئەم‌کردەوە پەسەندە • بەم‌جورە موسولمانان لە شارەکان‌و لادی‌کانا لەوزەمانەوە هەتا ئیستە لەسەر ئەم‌عیبادەتە بە شیوەی جەماعەت دەوامیان کردووە • کـــە وابوو ئەم‌نوێژە سوننەتە لەبەر بەجی‌هینانی حەزرەت لە مزگەوت‌و لە مالا ، وە جەماعەتەکەیشی سوننەتە یەکـــەم لەبەرئەوە کـــە حەزرەت

رازی بووه به کردەوەی ئەصحابەکان که لەپشتیەوه به جـــەماعەت ئەمنویژەیان‌کردو تەقریری کردوونو سەنعی نەکردوون• دووەم لەبەر ئەمری حەزرەتی عمر به کردنی بـه جـەماعەت ، چونکه لەســـەر فەرموودەی حەزرەت سوننەتی خەلیفه گـــەورەکان سوننـــەتی پیغەممەره • سیهەم لەبەر ئیجماعی سکووتی لەلایەنی ئەصحابەوه ••وه ئەگەر کەسی بلیت : ئەمنویژه سوننەت نی‌یه ، یا جەماعەتی سوننەت نی‌یه ، یا تەنیا له هەشت‌رکاتیانا سوننەته ئەوکەسه ریگەی سوننەتی ون کردووەو لەســەر حەق نی‌یه • وه پیویسته ئینســانی موسولمان ئاگای لەم‌مەسەله گــەورەیه بی •

وه واجبه بزانن ئەگەر کەسیکی بەروژوو به دەسەتقەســـــد له مانگی رەمەزانا روژووەکەی بشکینی به هوی جیماع‌کردن ئـــەوه بیجگه له گوناحی بەتال‌کردنەوەی روژووەکەی‌و بیجگه لەوه کـــه قەزای روژووەکەی لەسەره هەروا کەفارەتیشی ئەکـــەویته ســـەر • ئەوکەفارەتەش بریتی‌یه لەم‌سی‌شته : یەکەم عەبدیك ئازاد بکا ، ئـــەمه لەم‌زەمانا نی‌یه • دووەم : ئەوەیه دوو مانگ لەسەریەك بەروژوو بی•وه ئەگەر لەبەر نەخوشی یا پیری ئەمەی پی نەکرا واجبه طەعامی شەست مسکین بدا به هەریەکەی مشتیکی گەوره له قووتی زوربەی شوینی شەخسی روژووشکین • برا موسولمانەکانم ! ئاگاتان لـــه خوتان‌بی‌و پاریزگاری حوقوقی دینی ئیسلامی پیروز بکەن به دل‌و گیان بەلکو خوا رەحممـــان پـــی بکا ••

× × ×

الحمدلله • ثم الحمدلله • الحمدلله الذی ارشـدکم الـی دار السلام بنور الصیام ودلیل القیام •احمــده واشهد ان لااله الا اللـه وحده لاشریك له وان سیدنا محمدا عبده ورسوله الهـادی للانام • اللهم صل علی سیدنا محمد وعلی اله وصحبه واتباعه الی یوم القیام • خصوصا علی سادة دیننا ذوي القدر العلي والفخر الجلي ابی بکر وعمر وعثمان وعلي وعلی الحسن والحسین وحمزة والعباس وعلی الستـ

الباقية من العشرة المبشرة رضى الله تعالى عنهم اجمعين •

اوصيكم ايها الناس ! ونفسى اولا ، بتقوى الله وطاعته فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون • أيها المؤمنون ! ان لله نفحات قدسية ومراحم الهية فى اوقات خاصة وفرص سانحة فاغتنموها وخذوا منها زاد السعادة ليوم المعاد • ومنها دوام الصيام فى ايام رمضان واحياء لياليها بالقيام والطاعة وقراءة القرآن والصلوات النافلة ، لاسيما صلوة التراويح التى هى مفتاح ابواب الجنان • قال ، صلى الله عليه وسلم، فرض عليكم صيام رمضان وسنت لكم قيامه • وروى ان من صامه وقامه ايمانا واحتسابا وجبت له الجنة • وهذه التراويح عشرون ركعة صلى ، عليه السلام ، ثمانية ركعات منها فى المسجد واقتدى به فيها اصحابه الكرام وصلى اثنتى عشرة ركعه منها منفردا ف بيته ، وعليه جرى العمل حتى السنة الثانيـــة من خلافة عمر ، رضي الله عنه ، فجمع المسلمين على ادائها جماعة فى المسجد ، ورضى بها الصحابة واستمرت عليه امة الاسلام • اعوذ بالله من الشيطان الرجيم • هذا ذكر وان للمتقين عندنا زلفى وحسن ماب • نبهى الله واياكم من نومة الغافلين ، وحشرنى واياكم تحت لواء سيد المرسلين • آمين •

## خوتبەی سـێیهەم بۆ مانگی رەمەزان

**برا خوشەویستەکانم !**

ئەم‌رۆژووە کە فەرز کراوە لەسەرمان وەکو ئەمانەتی‌یەك وەهایە کە درابێتە دەسمان ،وە بەراستی هەمووعیبادەتی وەکو ئەمانەت وایە بەتایبەتی رۆژوو ، بویە حەزرەت ، صلى الله عليه وسلم ، فەرموویەتی: رۆژوو ئەمانەتە با هەموویەکی لە ئیوە ئەم‌ئەمانەتە باش راگیر بکات• براکانم ! رۆژوو وەکو حەزرەت فەرموویەتی ئەمانەتەو لەلایەنـی خواوە دراوەتە دەسمان کەوابی پیویستە تەماشـای ئادابی ظاهیـرو باطنی بکەین • وە لای پیاوە صالحە بەرزەکان رۆژوو تەواو نابیت

هەتا شبەش شت نەیەتە جی • (یەکەم) مەنعی چاو لە تەماشاکردنـــی حەرام • حەزرەت ، صلی الله علیه وسلم ، فەرموویەتی : روانین بو نامەحرەم تیریکی ژەهراوی‌یە لە تیرەکانی شەیتان، لەعنەتی لی‌بی • بی‌گومان ئەگەر ئینسان لەترسی خوا تەرکی ئەم‌جورە روانینە بکـا خوای گەورە ئیمانو باوەریکی. وەهای ئەداتی کە لەزەتو خوشـــی ئەوئیمانە لەدلی خویا ئەبینی • ( دووەم ) پاراســــتنی زمانە لە شتی پروپووچو درووغەیبەتو فیتنـــەیی‌و جنیـــودانو عەدرو قســەی بی‌وەفایی‌و موجادەلەکردن لەگەل رەفیقا • وە حەزرەت ، صلی اللـــه علیه وسلم ، فەرموویەتی : پینج شت هەن روژوو ئەشـــکینن : درووغەیبەتو دووزمانی‌و سوین‌خواردن بەدروو روانین بو نامـــەحرەم لەگەل ئارەزووی نەفسا • وە حەزرەت ، صلی اللـــه علیـــه وسلم ، فەرموویەتی : روژوو بو خاوەنەکەی وەکو قەلغان وایە لە ســـزای جەهەنەم ، کەوابی یەکی لە ئیوە ئەگەر بەروژوو بوو با قســـــەی خراپو فەحش بەدەمیا نەیەتو ئیشی نەفامانە نەکاتو ئەگەر یەکی شەری لەگەل کرد یا جنیوی پی‌دا پی‌ی بلیت : من بەروژووم ، مـــن بەروژووم • (سیهەم) پاراستنـــی گویچکەیە لە گوی‌راگرتـــن بـــو هەموقسەیەکی حـــەرام ، چونکـــە هەرشتـــی وتـــی حـــەرام بی گوی‌بوراگرتنیشی حەرامە ، بویە حەزرەت فەرموویەتی ئەوکـــەسە غەیبەت ئەکاو ئەوکەسە گویی بو رائەگری هەردووکیان هاوبەشـــن لە تاوانا • (چوارەم) پاراستنی باقی ئەندامی لەشە لە گوناحو مەنعی سکە لە خواردنی شتی حەرام ، چونکە مەعنای‌نی‌یە ئینسان خـــوی مەنع بکا لە خواردنو خواردنەوەی شتـــی حەلال کـــەچی بە رزقی حەرام بەربانگ بکاتەوە !! وە وینەی ئەم‌روژووەوانە وەهایە کـــــە قەسری دروست بکاو شاری بفەوتینی • بویە حەزرەت فەرموویەتی زور روژووەوانی وەها هـــــەیە کە لە روژووەکەی هیچی دەس‌ناکەوی بیجگە برسیەتی‌و تینوویەتی • وە هەندی لە زانایان فەرموویانە ئەمە کە حەزرەت فەرموویەتی ئەوانەن کـــە بەهوی روژووەوە لـــــە

خواردەمەنی پاکو خاوینو حەلال خویان مەنع ئەکەن کەچی بەربانگ بە حەرام ئەکەنەوە • وە هەندیکیتر فەرموویانە : ئەوانەن کــە لــە طەعامی حەلال خویان مەنع ئەکەنو روژوو ئەگرنو کەچی بە غەیبەتی خەلك ئیفطار ئەکەنەوە•وە بەعزیکیتر فەرموویانە ئەوروژووەوانانەن کە هەموولەشیان ناپاریزن لە گوناح•(پینجەم) ئەوەیە کە زور نەخوا لە کاتی بەربانگا • (شەشەم) ئەوەیە کە لەپاش بەربانگ دلی لەبەینی ترسو هیوادا بی ، چونکە نازانی ئایا خوای گەورە روژووەکـــەی قوبول کردووە یا رەدی ئەکاتەوە کەواتە هەرچەن ئەزانیو هەرچەن ئەتوانی داوای عەفوو چاوپوشی بکا لە خوای گەورە هەتا لە کەرەمی خوی بیبەشی نەکات • هەروەها زور سوپاسی خوا بکا لەسەر ئەوە کە یارمەتی داوە بو بەجیهینانی فـــەرزی روژووی ئەوروژە ، وە ئومیدی بەهیز بی کە خوا روژووەکەی لی قوبول کردبی بەنیشانەی ئەوەدا کە تەوفیقی داوە لەسەر گرتنی ، وە ترسی ئەوەشی ببی کــە ئـــەوروژووەی لی قوبول نەکا یا لەبەرئەوە بەتەواوی ئـــادابی بەجینەهینابی ، یاخو لەوعیبادەتەدا دەسیسەیەکی نەفسی بەهوی ریـــاو بەرچاوینییەوە تیکەل بوبی ، یا لەبەرئەوە کە خوا خاوەنی دەسەلاتەو ئەتوانی هەموو شتی بکا لەگەل مەخلووقاتی خویا • هەروەها لـــە هەموو عیبادەتیکا پیویستە ئینسان لەگەل ئەوەدا کە ئومیدی قوبولی هەبی ترسی رەدکردنەوەشی هەبیو بەهوی ئەوعیبادەتەوە خـــوی بەزل نەگریو ئەوعیبادەتە هەر بە مەحزی تەوفیقو میهرەبانی خـــوا بژمیری • وە زور پیویستە ئینسانی روژووەوان دەوام بکا لەســەر قورئان خویندنو شەو نویژکردنو باقی عیبادەتەکانو ئەمانە بکا بــە تکاکاری قوبولی عیبادەتی ئەومانگەی • وە حەزرەت ، صلی اللـــە علیە وسلم ، لە مانگی رەمەزانا گەلی مەشغـــوولی خویندنی قورئان بووەو فەرموویەتی : هەرکەس قورئان بخوینیو وەهابزانی کە یەکی هەیە ئیشیکی باشتر لە قورئان خویندنی کردووە ئەوە نیعمەتـــی خوای بە کەمو بچووك داناوە ، چونکە نیعمەتی قورئان لەســـەرووی

هەموو نیعمەتیکەوەیەو پایەبەرزترە لە هەموویان بو ئینسانی موسولمان•
خوا بە لوطفی خوی دوورمان بخاتەوە لە هەمووتاوانی بەتایبەتی
لەمانگی رەمەزانەدا ، وە عیبادەتی ئەمانگەش بکا بەهوی
رزگاریمان لە ئازارو بیکا یەهوی ئەنجامباشیو عاقیبەتخیریمان •

× × ×

الحمدلله • ثم الحمدلله • الحمدلله الذى قرر للطاعات ادابا مرضيات ، ورتب عليها درجات عاليات • احمده واشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له ، وان سيدنا محمدا عبده ورسوله • اللهم صل وسلم على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه والتابعين له فى الخيرات والحسنات ، خصوصا على سادة ديننا ذوى القدر العلى والفخر الجلى ابى بكر وعمر وعثمان وعلي وعلى الحسن والحسين وحمزة والعباس وعلى الستة الباقية من العشرة المبشرة رضى الله تعالى عنهم اجمعين • اوصيكم ايها الناس ! ونفسى اولا ، بتقوى الله وطاعته فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون • أيها المؤمنون ! اغتنموا الفرصة في شهركم هذا لنيل البركات ، وراقبوا الله تعالى في كل حالات ، واحفظوا قلوبكم وقوالبكم وحواسكم من التلوث برذائل الشهوات ومن الغفلة عن ذكر الله سبحانه رفيع الدرجات • وغضوا ابصاركم عن النظر الحرام • قال ، عليه السلام ، النظر سهم من سهام ابليس ، لعنه الله ، فمن تركه خوفا من الله اتاه ايمانا يجد حلاوته فى قلبه ، وكفوا اسماعكم عن استماع الحرام • قال ، صلى الله عليه وسلم ، المغتاب والمستمع شريكان فى الاثم• وكفوا السنتكمعن كل مالايكون ممدوحا فى الدين • قال ، صلى الله عليه وسلم ، الصوم جنة ، فاذا كان احدكم صائما فلا يرفث ولا يجهل ، وان امرؤ قاتله او شاتمه فليقل : انى صائم ، اني صائم • وكفوا بقية اعضائكم عمالا ينبغي • فقد قال ، صلى الله عليه وسلم ، كم من صائم ليس له من صومه الا الجوع والعطش • وفسره العلماء بالصائم الذى لايكف جوارحه عن الاثام ، واحترزوا عن اكثار الاكل من الحلال ، فان التجلى انما يظهر

على القلب الصافي ، والصفاء لايحصل الا برياضة النفس وقناعتهـــا وتقليل الملاذ النفسية ، وكونوا في اخر صيامكم علـى خوف ورجاء ، فان الله غني عن العالمين وهو ارحم الراحمين • اعـوذ بالله مـــن الشيطان الرجيم • (ان الذين امنوا وعملوا الصالحات كانت لهم جنات الفردوس نزلا) • نبهني الله واياكم من نومة الغافلين ، وحشرنـــي واياكم تحت لواء سيد المرسلين • آمين •

## خوتبەی چوارەم بو مانـــگی رەمەزان

**برا خوشەویستەکانم !**

ئەمەوی ئەمرو باسی ( ليلة القدر ) تان بوبکەم هەتا بە تەواوی تیبگەن لە گەورەیی ئەمشەوە پیروزەو بتوانن بەپێی توانا عیبادەتی تیا بکەنو رەزامەندی خواتان دەس بکەوی • براکانم ! پیویستـــە هەموموسولمانی باوەری وابی هەرخیرو پیروزی یەك کە بە ئومەتی ئیسلام بگات هەمووی بەهوی گەورەیی و پایەی بەرزی حەزرەتـــی پیغەمەرەوەیە • ئەنجا بزانن : کە حەرزەتی پیغەمەر محمدی کوری عبداللەی کوری عبد المطلب،صلی الله علیه وسلم لە سالی پینجصەدو حەفتای میلادی یا لە دایك بووە ، هەرلەوسالەدا ( ابرهە )ی حەبەشی کە پاشای یەمەن بوو بە سوپایەکی زورو فیلیکی فراوانەوە لـــــە یەمەنەوە هیرشی هینا بو شاری مەککەی موکەرەمە هەتا کەعبــــەی پیروز ویران بکا ، بەلام پیش ئەوەی بگاتــە مەککە خوای گـــەورە خوی و سوپاکەی بەرباد کرد • ئەمسالە مەشهوورە بە ســــالی فیل •

ئەمپیغەمەرە گەورەیە چەن مانگی پیش لەدایك بوونی عبداللەی باوکی لە سەفەری شاما وەفاتی کرد • وە کاتی لەدایك بوو عبد المطلبی باپیری هەلی گرتو بردی بو کەعبەو لەوی ناوی نا (محمد) • وە لە

تەمەنی شەش‌سالی‌یا دایکی ، کە ئامینـــەی کچـی وەهـــەب بوو ، وەفاتی‌کرد • وە لە عومری هەشت‌سالی‌یا باپیرەشی وەفاتی‌کرد ، وە لەسەر وەصیەتی ئەو لای ابوطالبی مامی ، کە باوکی حەزرەتی علـــي بوو ، مایەوەو ئەو بەخیوی ئەکردە وە لە عومری دوانزەســـــالیدا لەگەلیا رویشت بو شام ، بەلام لە شاری (بصری) لە نزیکی شاما بە ئەمری (بحیرا)ی عابید گـــەرانەوە بو مەککـــە • وە لـــــە تەمەنی حەڤدەسالیدا لەگەل زبیری مامیا بە تیجارەت رویشـــت بو ولاتـــی یەمەن • وە لە تەمەنی بیست‌وسی ســـالیدا بوو بە وەکیلی ( خدیجە)ی کچی ( خویلد ) لە تیجارەتا • وە لە تەمەنی بیست‌وپینج ســــــالیدا خەدیجەی مارەکرد ،وە لە حەزرەتی خەدیجە چوار کچ زینب‌و فاطمەو رقیەو ام‌کلثوم وە دوو کور قاسم‌و عبداللەی بوون • وە لە تەمەنـــی سی‌وپینج سالیدا هوزی قورەیش خانووی کەعبەیان تازە کـــردەوەو لەسەر دانانی (حجر الاسود) تیك‌چوون، چونکە هەرکەس ئەیویست ئەو بەردەکە لەشوینی خوبا دابنیتەوە ! وە حەزرەتیان کرد بە حەکەم ئەویش ئەمری فەرموو بەرمالیکیان راخست‌و بەردەکەی نایە ناوی‌و ئەمری فەرموو هەریەك لەوانە گوشەیەکی بەرمالەکە بگرن‌و بـــەرزی بکەنەوە وە حەزرەت خوی بەردەکەی هەلگرت‌و لە شوینەکەی خویا داینا ، وە بەم‌کردەوەیە زور ناوی پەیداکرد • وە هەر لە منالی‌یەوە بـــە ئەخلاق‌و رەوشتی بەرز ناوی دەرکردبوو بویە بە لەقەبی (امین) ناویان ئەبرد • وە هەر لە منالی‌یەوە هەتا گەورەیی لە یاســـای عـــــەرەب‌و بت‌پەرستی‌یان بیزار بووو بە گومرای ئەزانین • بەتایبەتی لە تەمەنی سی‌وشەشەوە حالی گوراو زورتر رووی‌کردە مەعنـــەوی‌یات‌و بەدل ئەی‌فەرموو : پیویستە ئەم‌عەرزو دەشت‌و کیوو سارا‌و دەریایانە ؛ ئەم‌ئاسمان‌و مانگ‌و روژو ئەستیرە بەرزە رووناکانە ، ئەم یاســـــای ریك‌وپیکی جیهانە پەروەردگاریکی گەورەی دەوام‌دارو بی‌نیازیان هەبی کە عالەم موحتاجی ئەوبیت‌و ئەو موحتاجی کەس نەبیـــت ، وە هەرچی صیفەتی گەورەیی‌یە بیبیت‌و لە هەموو خەوش‌و عەیبیك دوور

بی‌و ، به‌ته‌نیا خوی ســـــه‌ربه‌خو ئه‌م‌جیهـــانه بیا بـــه‌ریوه • وه بو وردبوونه‌وه له‌م‌بابه‌ته‌وه هه‌مووسالی توشه‌ی مانگیکی هه‌لئـــه‌گرت‌و ئه‌رویشته ئه‌شکه‌وتی مه‌شهوور به ( حراء ) له ژووورووی شـــــاری مه‌ککه‌وه ، وه به‌م‌جوره ده‌وامی کرد تا ته‌مه‌نی گه‌یشته چل ســال ، له‌وساله‌دا له مانگی ره‌مه‌زانا لـــه روژی حه‌قده یا بیســت‌ویه‌کیـــا حه‌زره‌تی ( جبرائیل ) له لای خواوه هات بو لای‌و چــه‌ن ئایه‌تیکی قورئانی به‌سه‌را خوینده‌وه • ئه‌وه‌ی شایانی باسه قورئانی که‌ریـــم هه‌مووی له شه‌وی ئه‌وروژه‌دا لای باره‌گای خوای گه‌وره‌وه هاتــه خوار بو ئاسمانی یه‌که‌م • وه ئه‌م‌شه‌وه له سووره‌تــی ( قدر ) ا ناو براوه به ( ليلة القدر ) ، وه له سووره‌تی ( دخان ) ا ناو براوه بـــه (ليلة مباركة) ، وه له سووره‌تی (البقرة)دا خوا فه‌رموویه‌تی : ئیمــه قورئانمان له مانگی ره‌مه‌زانا نازل کردووه • که‌وابی (ليلــة القــدر) شه‌ویکه له مانگی ره‌مه‌زان‌و ئه‌وشه‌وه ئه‌وه‌نده گه‌وره‌یه که عیبـــاده‌ت تیایا چاکتره‌و خیری زورتره له عیباده‌تی هه‌زار مانگی‌تر•وه ئه‌وشه‌وه هه‌ر ئه‌وشه‌وه‌یه که له روژه‌که‌یا قورئان هاتووه بو پیغه‌مه‌ر ، صلــی الله عليه وسلم • به‌لام لای ئیمه دیاری نی‌یه هه‌تا له هه‌مووشه‌وه‌کانی ره‌مه‌زانا حازر بین بو عیباده‌ت‌کردن ، وه حه‌زره‌ت ، صلی الله علیــه وسلم ، فه‌رموویه‌تی : بگه‌رین به‌دوای (ليلة القدر)ا له ده‌ی ئاخــری ره‌مه‌زانا له تاقه‌کانیانا وه‌کو بیست‌ویه‌ك‌و بیست‌وسی هه‌تا بیست‌ونو، وه ئیمـــامی شافیعـــی ، خوای لی رازی بی لای‌وایه که شـــــه‌وی بیست‌وسی‌ی ره‌مه‌زانه ، وه هه‌ندی زاناياني‌تر لايان‌وایه که شـــه‌وی بیست‌ونوی ره‌مه‌زانه • وه له حه‌دیثا ریوایه‌ت کراوه کـــه حه‌زره‌ت، صلى الله علیه وسلم ، له ده‌ی ئاخری ره‌مه‌زانا به‌راده‌یه‌ك خه‌ریکــی عیباده‌ت ئه‌بوو که له‌باس‌کردن نایه‌ت ، به روژا قورئانی ئه‌خویندو به شه‌وا نویژی ئه‌کردو هه‌موو کات مالی ئه‌به‌خشیـــــه‌وه بـــــه فه‌قیرو داماوانا ، بویه پیویسته موسولمانان له‌سه‌ر ره‌وشتی پیغه‌مه‌ر بن لــه مانگی ره‌مه‌زاناو شه‌وانی (ليلة القدر) به‌خه‌به‌ر بن‌و عیباده‌ت بکه‌ن ،

چونکه کاتی نازلبوونی قورئانەو، قورئان هوی رزکاری ئادەمیزادە
لە تاریکی کوفرو خووو رەوشتی خراپ ،وە قورئان عالەم بانگ ئەکا
بو ئیمان بە خواو پیغەمەرانو جەزای ئەعمالو بو هەررەفتاری کە
ئەبی بەهوی سەعادەت لە هەردوو دنیادا • کەوابی ئەبی ئەمانگی
رەمەزانە وە بەتایبەتی دەی ئاخری ، وە بەتایبەتی شەوی لیلـة القدر
بە فرسەت بزانین ، هەتا بگەین بە ئامانجی بەرزی ژیان لە هەردوو
دنیادا کە سەعادەتو سەربەرزی‌یە •

× × ×

الحمدلله • ثم الحمدلله • الحمدلله الذی تفضل علـى عباده بتشريع صيام رمضان ، وفضل رمضان بليلة القـدر التي انـزل فيها القرآن • احمده واشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له وان سيدنا محمدا عبده ورسوله اكرم الرسل عند الله المنان • اللهم صل وسلم على سيدنا محمد وعلى اله واصحابه واتباعه باحسان الى يوم الدين ، خصوصا على سادة دیننا ذوی القدر العلى والفخر الجلى ابي بكر وعمر وعثمان وعلي ، وعلى الحسن والحسين وحمزة والعباس ، وعلى الستة الباقية من العشرة المبشرة رضى الله تعالى عنهم اجمعين •

اوصيكم ايها الناس ! ونفسى اولا ، بتقوى الله وطاعته فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون • ايها المؤمنون ! قال الله تعالـى فى القرآن الكريم : (انا انزلناه فى ليلة القدر ، وماادريك ماليلـة القدر ؟• ليلة القدر خير من الف شهر ، تنزل الملائكة والروح فيهـا باذن ربهم من كل امر سلام ، هى حتى مطلع الفجر) • وقال تعالـى (انا انزلناه في ليلة مباركة انا كنا منذرين ، فيها يفرق كل امر حكيم) • والمفهوم من هاتين الايتين الشريفتين ان ليلة القدر هى تلك الليلـة المباركة • وقال ، سبحانه وتعالى ، شهر رمضان الذى انزل فيه القرآن هدى للناس وبينات من الهدى والفرقان • ويفهم من محتوى الايتيـن السابقتين مع هذه الاية الكريمة ان ليلة القدر المباركة هى ليلة مـن ليالى شهر رمضان • فواجب الانسان المسلم ان لايكون من الغافليـن

عن تجليات ربه المنان في هذه الاوقات والازمان • كيف لا ؟ ولكم في رسول الله اسوة حسنة ، فقد كان ، عليه الصلاة والسلام ، اذا دخل العشر الاواخرمن رمضان شد مئزره وشمر عن ساعد الجد في الاشتغال بقراءة القرآن واحياء لياليها بغية الفوز بما في ليلة القدر من البركات والاحسان • وقد ابهمت علينا كساعة اجابة الدعاء في يوم الجمعة لنكون في جميع اوقات رمضان على نشاط واهبة الاستعداد للطاعة وتحصيل اسباب السعادة • ويرى الامام الشافعي رضي الله عنه انها ليلة الثالث والعشرين من الشهر ، كما يرى بعض اخر انها الليلة السابعة والعشرون منه ، كل على ماظهر له من الدليل والبيان • اعوذ بالله من الشيطان الرجيم • واذا سألك عبادي عني فاني قريب اجيب دعوة الداعي اذا دعان فليستجيبوا لي وليؤمنوا بي لعلهم يرشدون • نبهني الله واياكم من نومة الغافلين ، وحشرني واياكم تحت لـــواء سيد المرسلين • آمين •

## خوتبەی پینجەم بو مانگی رەمەزان

هەركەس لە ژیانی خویا خوا یارمەتی‌بدا بو ئیشیكی بەرزی مایەداری خاوەن‌سوود حەقیەتی شایی بكاو خوشی خوی دەربری وە بەراستی روژووی مانگی رەمەزانیش یەكیكە لەوعیبادەتانە كە شایستەی شایی‌یەو موسولمانان حەقیانە پیروزبایی لەیەكتر بكەن بەهوی بەجی‌هینانیەوە • وە خوای گەورە لە قورئانی پیروزا موژدەی پاداشی باشی داوە بەوكەسانە كە بەروژووئەبن ،وە لە حەدیثی قودسی‌دا فەرموویەتی : هەمووكردەوەیەكی ئادەمیزاد بو خویەتی مەگەر روژوو ، روژوو هەر بومنەو من جەزای ئەدەمەوە لەسەری • یانی : هەموو عیبادەتی مەجالی ئەوەی تیایە كە بە (ریا)و بەرچاوینی بكری ، بەلام روژوو زور دوورە لەوەی كە بە (ریا) بكری ، وە ئادەمیزاد لە شوینی تەنیایی‌و خەلوەتا لەبەر خوا نەبی خوی مەنع ناكا لە خواردن‌و خواردنەوە• وە لەسەر ریوایەتی (طبرانی)و (بیهقی)

حەزرەت ، صلی الله علیه وسلم ، فەرموویەتی : کردەوەی ئادەمیزاد حەوت جورە • دوانیان ئەبنە هوی دوو شتــی بەئەهــەمی‌یەت ، وە دوانیان بەقەد خویان پاداشــیان هەیە ، وە یەکیکیان دەقات جەزای ئەدریتەوە ، وە یەکیکیان حەوت‌صەدقات ، وە یەکیکیــان ئەوەنــدە خیری زورە خوانەبی کــەس نازانی پاداشــی چەنەو چونە ! • ئەودووشتەی پیشوو یەکەمیان ئیمانو دووەمیــان کوفرە ، چونکــە ئیمان بەخوای تەنیا ئەبیتە هوی جەزای بەهەشتی نەبراوەو ئینکارو کوفرو باوەرنەکردن بەخوا ئەبیتە هوی جەزای جەهەنەمی نەبراوە • وە دوانەکەی‌تر ئەوەیە یەکیك گوناحیك بکا کە هەر بەقەد خــوی جەزای هەیە ، وە ئەگەر یەکی عەزمو قەسدی کردنی خیری بکــاو بوی ریك نەکەوی بەقەد کردنی خیرەکــە جەزای ئەدریتــەوە • وە پینجەم کردەوەی چاکــەیە کــە هەرکــەس بیکا بە دەقات جــەزای پی‌ئەدری • وە شەشەم بەخشینی مالە لــە ریگــەی خوادا کــە هەتا حەوت‌صەد قات جەزای خیری هەیە • وە حەوتەم روژووە کە کــەس نازانی جەزای چەندیکە بیجگە زاتی خوای گــەورە • وە لەســەر ریوایەتی ئیمامی احمدو طبری ، خوایان لی رازی بــی ، حــەزرەت فەرموویەتی : روژووگرتنو قورئانخویندن لە روژی قیــامەتا تکا ئەکەن بو خاوەنەکانیان ، روژوو ئەلیت : یا رەبی ! من بووم بە هوی مەنعی خواردنو خواردنەوەو ئارەزووی نەفس لەم‌ئینســانە ، داوا ئەکەم کە مەیدانی تکاکردنم بدەی بوی • وە قورئانیش ئەفەرمویت: یا رەبی ! من بووم بە هوی مەنعی نووستنی شەو لە خاوەنەکەم کــە ئەیخوندم لە خەلوەتاو بەشەوا ، ئیستە داوا ئەکەم کــە مــەیدانی تکاکردنم بدەی • وە حەزرەت ، صلی الله علیه وسلم ، ئەفەرمویت : خوای گەورەش ئیزنیان ئەداو تکای خویان ئەکەن بو عەفوی تاوانی خاوەنەکانیانو خوایش بە لوطفی خوی تکاکەیان قوبوول ئەکاتو بە کــەرەمی خوی عەفویان ئــەکات •

برا خوشەویستەکانم ! لەسەر ئەم‌ئایەتو حەدیثە موبارەکانــە

ئەوانە کە رۆژوویان گرتووەو قورئانیان خوێندووە گوناهیان عەفــو ئەکرێت ، وە ئەمە موژدەیەکی گەلی خوش‌و بەنرخە • وە پیویستە ، مادام بەهوی ئەمانەوە گوناحی بەینــی خومان‌و خوا عــەفو بکری، تیبکوشین بو ئەوەی حەقی خەلکیــش لەســەر خومان نەیەلیــن‌و هەرکەس حەقی یەکیکی لەسەرە بیداتەوە یا داوای گەزدن‌ئازایی لی بکات ، هەتا بە ئازادی‌و دل‌شادی بە خزمەتی خوای خومان شاد ببین •

هەروەها پیویستە بزانن کە خوای گــەورە زەکاتی (فطــرە)ی واجب کردووە لەسەر موسولمان بەوشەرتەی ئەوشەخســە ئەوەندەی هەبی زیاتر بی لە نەفەقەی خوی‌و ئەوانەی نەفەقەیان لەسەریەتی بــو ماوەی شەوو روژی جەژن • وە پیویستــە ئەم‌سەرفیطــرەیە لەباتی خوی‌و ئەوانەی کە نەفەقەیان لەسەریەتی بیدات بە کــەسي کــــە موستەحەق بیت ، یانی : بەوکەسانەی کە هەژارن‌و هیچیان نی‌یە ، یا شتیکیان هەیەو بەلام بەشی گوزەرانیان ناکات،یا ریبوارو بی خەرجی‌و داماون ، یا قەرزارن بەریگایەکی شەرعی وەکو باسمان کرد لە باسی زەکاتی مالا • وە ئەم‌سەرفیطرەیە بریتــی‌یە لــە یەك (صاع) کـــە عەیارەیەکی تایبەتی زەمانی حەزرەتی پیغەمبەر بووە ، جا ئەگـــەر ئەوعەیارە هەبوو ئەوا ئاسانە ، ئەگینا بە کیشانە بریتی‌یە لە وەزنــی چوارصەدوهەشتاوچوار (مثقال) لە قووتی زوربەی ئەوشوینەی کــە خوی‌و خیزانی تیایا ئەژین • وە بە فەرموودەی حەدیثی پیغەمبــەر ، صلی اللہ علیه وسلم ، ئەم‌زەکاتی فیطرەیە ، بیجگەئەوە کە یارمەتی‌دانی هەژارو داماوانە لەوروژە پیروزەداو خیریکی گەورەیە ، ئەبیتە هوی پرکردنەوەی هەرکەم‌وکوری‌یەك کــە لــە روژووەکەدا بووبی • وە ئەم‌سەرفیطرەیە بە روژئاوابوونی ئاخرروژی رەمەزان واجــب ئەبی، وە باشتر ئەوەیە لە پیش نویژی جەژنا بدریت ، وە ئەگەر لە نویژی جەژنیش دواکەوت دروستەو بەجی‌یە ،بەلام ئەگەر لە روژی جــەژن دواکەوت ئەبیتە قەرزو واجبە تەسلیمی موستەحەقی بکەن •

لە پایانا واجبە هەموومان سوپاسی خوا بکەین کە یارمەتی‌داین

بو ئەمعیبادەتە گەورەیە کە مایەی سەبەرزیو سەعادەتە •

X X X

الحمدلله • ثم الحمدلله • الحمدلله الذى احب الصائمين والصائمات ، وافاض عليهم وعليهن اصناف المراحم والكرامات فى الدين ، احمده واشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له وان سيدنا محمدا عبده ورسوله الامين ،اللهم صل وسلم على سيدنا محمد وعلى اله واصحابه واتباعه الى يوم لقاء الملك المبين ، خصوصا على سادة ديننا ذوى القدر العلى والفخر الجلى ابى بكر وعمر وعثمان وعلي ، وعلى الحسن والحسين وحمزة والعباس ، وعلى الستة الباقية من العشرة المبشرة • رضى الله تعالى عنهم اجمعين •

اوصيكم ايها الناس ! ونفسى اولا ، بتقوى الله وطاعته فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون • ايها المؤمنون ! عد الله الصائمين والصائمات فى عداد من قرر لهم الاجر والسعادة يوم الدين كيف لا ؟ وقد ورد في الحديث القدسي ان جزاء الصوم لا يعلمه الا الله ، وان الصوم لله وهو يجزى عليه•وروى الامام احمد والطبرانى، رضى الله عنهما ، ان النبى ، صلى الله عليه وسلم ، قال : الصيام والقران يشفعان للعبد يوم القيامة ، يقول الصيام : اى رب منعته الطعام والشهوة فشفعنى فيه ، ويقول القرآن : منعته النوم بالليل فشفعنى فيه ، قال : فيشفعان • وعليكم بالوقوف فى حالة الخوف والرجاء • اما الخوف فمن رد الله عبادتنا من حيث انه لم يتيسر فيها الاخلاص كما هو اللائق بمقام رب العالمين ، وانما يتقبل الله من المتقين ، او من حيث ان الله مالك الملك وملك الملوك يفعل مايشاء ويحكم مايريد ، ولا يسئل عما يفعل فى عباده بل فى العالمين اجمعين• واما الرجاء فمن وفور نعمته وسعة رحمته التى وسعت كل شىء والاقرب اليها هو صنف العباد الصالحين • لعل الله يتفضل عليكم بما يليق بفضله المبين • وعليكم باداء زكاة القطر للمستحقين من الفقراء

والمساكين وابناء السبيل والغارمين ، وكلما كان المستحق من اهــــل القرابة كان الاداء اليه اولى لحيازته اداء الواجب وصلة الرحم الواجبة بين المسلمين • وتجب على كل حر مسلم ملك فاضلا عن نفقة ليلــــة العيد ويومه لنفسه ولممونه ، وتجب بغروب الشمس من اخر يــــوم رمضان ، ويكون ادائه قبل صلاة العيد من شعار المخلصين • وهــى صاع من غالب قوت المحل الذى فيه الشخص ولا تجزىء القيمــة الا بتقليد بعض الائمة المجتهدين • وهى وسيلة لجبرما حصل من الخلــل فى الصيام ، وواسطة للوفاء بحق الاخوة الصادقة بين المسلمين• اعوذ بالله من الشيطان الرجيم • هذا بيان للناس وهدى وموعظة للمتقين • نبهنى الله واياكم من نومة الغافلين ، وحشرنى واياكم تحت لواء سيد المرسليــن • آميــــن •

× × ×

## الخطبـــة الاولى لعيـــد الفطـــر

الله اكبر (تسعا) . الله اكبر مافاز بالخيرات اهل الصيام والقيام. الله اكبر مافاضت الرحمة والبركة على اهل الاسلام . احمده واشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له وان سيدنا محمدا عبده ورسولـه الهادى الى دار السلام . اللهم صل على سيدنا ومولانا محمد وعلـى آله وصحبه واتباعه البررة الكرام ، خصوصا على ســـادة ديننا ذوي القدر العلى والفخر الجلى ابى بكر وعمر وعثمان وعلي ، وعلى الحسن والحسين وحمزة والعباس ، وعلى الستة الباقية من العشرة المبشـرة رضى الله تعالى عنهم اجمعين .

اوصيكم ايها الناس ! ونفسى اولا بتقوى الله وطاعته فان اللــه مع الذين اتقوا والذين هم محسنون . ايها المؤمنون ! . اوصيكـــم بتقوى الله الذي وفقكم للوفاء بحق الصوم ، ثم آتاكم الاجر الموفور فى هذا اليوم . فاستعدوا لعمل الخير الذي هو شعار المؤمن في هذه الاوقات التى تتنزل فيها البركات على اهل الطاعات.واوصيكم بافاضة البر والنعمة والسماح والكرم والرحمة والعفوعما قد مضى وسلف من كل مايوجب الاسى والاسف ، والوفاء بحق صلة الارحام ومواســاة الضعفاء والارامل والايتام ، والوفاء بواجب الوحدة الاسلامية وهــى وحدة القلب والاخوة والاعتصام .

ايها المؤمنون ! ليس العيد لمن لبس الجديد واكل اطيب المطعوم، بل العيد لمن استفاد من خيره وبره وفضله السائل والعائل والمحروم ، والعيدلمن توجه الى الله الكريم بطبع صاف وقلب واسع سليم ،والعيد لمن تزود بالتقوى والعبادة ، والعيد لمن استقام على مسلك السعادة . فهنيئا لمن كان عيده كاعياد السلف الصالحين ، وهنيئا له بجزاء عملـه المشكور يوم اللقاء بالروح والرياحين. واخرجوا صدقة الفطر عنكـم وعن كل من تلزمكم نفقتـه صاعا من غالب قوت محلكم ، ولا تجزىء القيمة الا بتقليد بعض الائمة المجتهدين . فكبروا الله على ماهداكـم

واشكروه على ماولاكم من نعمه لعلكم تفلحون • اعوذ بالله من الشيطان الرجيم • ان فى هذا لبلاغا لقوم عابدين وما ارسلناك الا رحمة للعالمين • نبهنى الله واياكم من نومة الغافلين ، وحشرنى واياكم تحت لواء سيد المرسلين • آمين •

## الخطبة الثانية

الله اكبر ( سبعا ) • الله اكبر ما عاد العيدان • الله اكبر ما كرّ الجديدان • والحمدلله حمدا يوافى نعمه ويكافىء مزيده • احمده واشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له وان سيدنا محمدا عبده ورسوله• اللهم صل وسلمعلى سيدنا محمد وعلى آله وصحبه واتباعه باحسان الى يوم الدين •

اوصيكم ايها الناس ! ونفسى اولا ، بتقوى الله وطاعته فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون • ايها المؤمنون ! جددوا آداب الاخوة الصادقة بينكم باتحاد القلوب والتعاون والاعتصام بدين الاسلام ورعاية كل ضعيف الحال من افراد امة الاسلام،ولاسيما من له حق صلةالارحام ، وصلوا وسلموا على من ختمت به النبوات والمعجزات كما قال رب الارض والسموات : ان الله وملائكته يصلون على النبى ياايها الذين آمنوا صلوا عليه وسلموا تسليما • اللهم صل على سيدنا محمد المبعوث بالرحمة للانام من الانس والجان القائل : الراحمون يرحمهم الرحمن • ياايها الذين آمنوا صلوا عليه وسلموا تسليما •

اللهم اغفر للمؤمنين والمؤمنات ، والمسلمين والمسلمات ، الاحياء منهم والاموات ، اللهم انصر من نصر الدين واخذل من خذل المسلمين والهم رجال حكومتنا الحق والعدل وآزرهم بالنصر المبين ، وايد جيشنا الباسل لصيانة العباد والبلاد وسائر جيوش المسلمين برحمتك ياارحم الراحمين • بارك الله تعالى لنا ولسائر المسلمين فى يومنا هذا وسائر ايامنا الى يوم الدين • آمين •

× × ×

لاتكون الا لمن اطمئن قلبه بذكر اللهولمن داوم على اطاعة مولاه فامتثل
ماامر به واجتنب عن كل مانهي عنهوتحلى بحلى الاخلاق الفاضلة مـن
الرشد والصدق والصبر والامانة والوفاء • ومن كان ذلك دأبه فلا شك
ان الجنة مثواه وان مآله الى رضا مولاه • اعوذ بالله من الشـيطان
الرجيم ان الذين قالوا ربنا الله ثم استقاموا تتنزل عليهم الملائكـة
الا تخافوا ولا تحزنوا وابشروا بالجنة التى كنتم توعدون • نبهنيالله
واياكم من نومة الغافلين ، وحشرني واياكم تحت لواء سيد المرسلين •
آمـين •

## خوتبـەی چوارەم بو مانگی ذي القعدة

**برا موسولمانەکانم !**

روژیك حەزرەت ، صلـى اللـه علیـه وسلـم ، ئاموژگاری (أبوذري غفاری) کرد ، خوای لی رازی بێ ، جا لەبەر ئـەهەمیەتی ئەمئاموژگاری‌یە ئەمەوی ئەمرو بوتان بگیرمەوە بەلکو سوودی لی وەربگرن • وە لەپیش ئەوەی کە بچمە سەر باسی ئاموژگاری‌یەکـە ئەمەوی پیتانبلیم کە ئەمزاتە لەخواترسە یەکیکە لەوئەصحابانە کـە زور خەریکی عیبادەت بوون وە حەزی لە دنیا نەکردووەو گـەلیجار لەسـەر ئاموژگاری موسولمانانو مەنعکردنیـان لە رابواردنو بەجیهینانی لەزەتی نەفس خەلکی عاجز کردووەو ئەوانیش ئەمیـان زویر کردووە ، وە پیغەمبەر ، صلی الله علیه وسلم ، پیی‌فەرمووە : ئەی (أبوذر) ! تو بە تەنیا خوت ئوممەتیکیو بە تەنیا ئەمریو بە تەنیا زیندوو ئەکرییتەوە • وە گەلی حیکایەتی هەیە کە لە کتیبی سیرەتو حەدیثـا باسکراوە •

حەزرەت ، صلی اللـه علیـه وسلم ، لـە ئاموژگاری‌یەکـەیا ئەفەرمووی : ئەی ( أبو ذر ) ! وەصیەتت بوئەکەم بـە تەقوای خواو هەمیشە لە خوا بترسەو شەوکی ... هەرچی ئەو واجبـی

کردووه بیکه وه هەرچی حەرامکردووه مەیکەو بەهوی غەیری خواوه لە خوا غافل مەبە ، بەلکو لەبەر ئاگاداری لە حەقی خوا عالەم فەراموش بکە چونکە تەقوا سەری هەمووخیـــریکەو سەری هـــەمووشتیکـــە لەوشتانە کە بو موسولمان خاوەن سوود بن • وە فەرمووی : بەپیی توانا خەریکی قورئانخویندنو زیکری خوا بە ، چونکە زیکری خوا ئەبیتە هوی ئەوە کە خوا لەناو مەلائیکە موقەرەبەکانا باست بکا وە ئەبی بە رووناکی دلو چاوت لە دنیادا • وە فەرمووی هەمیشـــــە بیدەنگو کەمقسە بە ئیلا لە خیرا چونکە قسەنەکردنو بیدەنگـــی شەیتان دوورئەخاتەوە لیت چ شـــەیتانی ئادەمیزادو چ شەیتانی جن ، بەراستی بەشی زوری ئەورەحمەتانە کە تووشی ئادەمیزاد ئەبن لــــە زمانەوەیە ، وە هەرکەس کەمدوو بی کەمزیان ئەبی ، بـــەلی ئەگـــــەر قسەکە لە خیرا بی وەکو دەرزوتـــەوەو ئاموژگاری موســـولمانانو ریکخستنی ناوبەینی خەلکو شتیوەها کە سوودی بو ئیسلامیەت هەبی ئـــەوە خیـــرەو جارجار واجبەو هـــەندی جار ســـوننەتە• وە فەرمووی :خوت بپاریزە لە پیکەنینی زور چونکە پیکەنینی زور دلی موسولمان ئەمرینـــیو دووری ئـــەخاتەوە لە نووری ئیســـلامیەتو رەونەقی روخساری ئینسان کز ئەکات • وە فەرمووی : هەتا ئەتوانی (جهاد) بکە لە ریگەی خوادا بەدەستو زمانو مالو بە هەر جوری کە بوتری ئەکەوی چونکە غەزاکردنو کوشش لـــەریگەی دینا لــــە هەمووعیبادەتو کەنارەگرتنی باشترە • وە فەرمووی : ئینســــــانی مسکینو بیمالت خوش بویو لەگەلیانا دابنیشە چونکە ئەمانە دلیان زەعیفەو لە توغیانو فیزو دەمارەوە دوورن ، وە ئینسان بە رابواردن لەگەل ئەمانە فیری قەناعەت ئەبیو نەفسی کز ئەبی وە ئەگەر ژیانیشی نارەحەت بی کە چاوی بەوانە کەوت سوپاسی خوا ئەکاو بە بەشەکەی خوی رازی ئەبی • وە فەرمووی : لە ژیانی دنیادا بو ئەوانە مەروانە کە لە تو بەرزترن بەلکو بو ئەوانە بروانە کە لە تو نزمترن ، ئـــــەمە ئەبیتە هوی ئەوە کە نیعمەتی خوات لا بەقەدر بیو بە سووکی بـــوی

نەروانی • وە فەرمووی : چاکە بکە لەگەل خزمو کـــەس‌و کارتاو صیلەی رەحم بەجی‌بینە ئەگەرچی ئەوانیش لەگـەل تودا خراپ بن ، چونکە بەراستی پیاوەتی ئەوەیە ئینسان لەگەل ئینســانی خراپا باش بی ئەگینا چاکەکردن لەگەل چاکانا منەتی نی‌یەو نابیتــە هوی بەرزی‌ پایەی ئینسـان • وە فەرمووی : قسـەی حەق بکە لـە شـوینی خویا هەرچەن ئەوقسـە حەقەش لە زەوقی ئەوکەسەدا کە قسەی لەگـــەلا ئەکەی تال بی ، وە لە سەرزەنش‌و لومەی خەلك مەترسەو لە ترسـی سەرزەنش تەرکی قسەی راست مەکە ، وەبا ئەوصیفەتانە کە لە خوتا هەن‌و باش نین بین بـە هوی شـەرمی خوت‌و مەنعـت بکەن لـە هیرش‌بردنەسەر خەلك • یانی : پیویستە پیش ئەوەی ئاموژگاری خەلك بکەی بو مەنع‌کردنیان لە خراپە خوت ئەو صیفەتە خراپە لـە خوت دووربخەیتەوە • وە هەرکاتیك ئاموژگاریت کردن رق مەگرەو بە کینەو غەرەزەوە قسەیان لەگەل مەکە چونکە ئەم شیوەیە لە باتـی ئەوەی سوودی بی ئەبیتە هوی پەشیوی‌و پەریشانی دلی خەلکەکە، چونکە زور عەیبە ئینسان سی صیفەتی تیاهەبی یەکەم : عەیبی خەلك ببینی‌و لە عەیبی خوی کویر بی، دووەم : شەرم‌بکا لە صیفەتی خراپی خەلك کەچی ئەوصیفەتە لەخویا بی ، سیهـەم : لەکاتی ئاموژگاری‌یا ئازاری رەفیقی خوی بدا • وە فەرمووی : ئەی (أبوذر) ! هیچ‌عەقلی نی‌یە بەقەد دووربینی بەسوود بی • وانە : پیویستە هەمیشە ئینســان چاوی لە پاشەروژەوە بی‌و لە دوستی‌یا بەشی دوژمنی بیلیتەوەو لـە دوژمنی‌یا بەشی دوستی هەلگری ، وە لە جوانی‌یا ئاگای لە کاتـــی پیری هەبی‌و لە ساغی‌یا بیری ناساغی لا بی‌و لـە ژیانا چاوی لـــە پاش‌مردنیەوە هەبی‌و هەرقسەیە ئەیکا ئاگای لە مەعناو تأثیرەکـەی بی‌و هەرکردەوەیەك ئەکا بیری بەلای ئەنجامەکەیەوە بی•وە فەرمووی: ئەی (أبوذر) ! وەرع نی‌یە لە دنیادا بەقەد خوپاراستـن لە حـەرام‌و ئیشی نابار باش بی وە هیچ‌صیفەتی نی‌یە بەقەد خوش‌خولقی باش بی بو ئینسـان بەتایبەتی لەگەل ئەوانەدا کە زور تیکەلیانەو لەگەلیـــان

هەڵئەسیو دائەنیشی ، وە بەتایبەتی لەگەڵ ماڵو خیزانو خزمەتکارو رەنجبەرا ، وە نیشانەی ئەمەش ئەوەیە هەرکاتی ئەوشەخسە دیاربوو هاوریکانی دلخوش بنو هـەرکاتی دیارنـەبوو بـەدل ئارەزووی دیداربینی بکـەن .

بەراستی ئەم ئاموژگاری‌یە ئەوەندە بەنرخە هەرکەلیمەیەکی بو ئەوە ئەشی کە ئینسان بەدلوگیـان وەری‌بگریـتو لەژیانی خـویا رەفتاری پی‌بکا ، وە لە خوام ئەوی یارمەتیمان‌بدا هەتا بتوانین لەبەر روشنی ئەم‌ئاموژگاری‌یانە بروین بەریدا بەلکو ببیتە هوی سەعادەتی دنیـاو قیامەتمـان .

× × ×

الحمد لله . ثم الحمد لله . الحمد لله الذي جعل حبيبه مرشـدا للعاقل الذى له قوة الاسترشاد وجعله وسيلة لتنبيه الناس على التزود بزاد المعاد . احمده واشهد ان لااله الا اللـه وحده لاشـريك له وان سيدنا محمدا عبده ورسوله الى كافة العباد . اللهم صل على سيـدنا محمد وعلى آله واصحابه واتباعه الخيرين الامجاد ،خصوصا علـى سادة ديننا ذوى القدر العلى والفخر الجلى ابى بكر وعمر وعثمـان وعلي ، وعلى الحسن والحسين وحمزة والعباس ، وعلى الستة الباقيـة من العشرة المبشرة ، رضى الله تعالى عنهم اجمعين .

اوصيكم ايها الناس ! ونفسى اولا ، بتقوى الله وطاعته فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون . ايها المؤمنون ! عليكم بالاتعاظ بما وصى به رسول الله ، صلى الله عليه وسلم ، احد اصحـابه الزهاد وهو ابوذر الغفارى ، رضى الله عنه حيث قال له : ياباذر ! اوصيـك بتقوى الله فانه راس الامر كله . وعليك بتلاوة القرآن وذكر الله فانه ذكر لك فى السماء ونور لك فى الارض . عليك بطول الصمت الا فى خير فانه مطردة للشيطان عنك وعون لك على امر دينك . واياك وكثره الضحك فانه يميت القلب ويذهب بنور الوجه .عليك بالجهـاد فانـه

رهبانية امتي • احب المساكين وجالسهم • انظر الى من تحتك ولاتنظر الى من فوقك ، فانه اجدر ان لا تزدري نعمة الله عندك • صل قرابتك وان قطعوك • قل الحق وان كان مرا • لاتخف في الله لومة لائم ليحجزك عن الناس ماتعلم من نفسك ولاتجد عليهم في ماتاتي ، وكفى بالمرء عيبا ان يكون فيه ثلاث خصال ان يعرف من الناس مايجهل من نفسه ويستحي لهم مما هو فيه ويؤذي جليسه • ياأباذر ! لاعقل كالتدبير ، ولاورع كالكف ، ولاحسب كحسن الخلق • اعوذ بالله من الشيطان الرجيم وما آتاكم الرسول فخذوه وما نهاكم عنه فانتهوا واتقوا الله ان الله شديد العقاب • نبهني الله واياكم من نومة الغافلين ، وحشرني واياكم تحت لواء سيد المرسلين آمين •

## خوتبەی پینجەم بومانگی ذي القعدة

**برا موسولمانەکانم !**

لە وتاری ئەمجومعەدا باسی ئەوئاموژگاری‌یەتان بوئەکەم کە حەزرەت ، صلى الله عليه وسلم ، بە (أنسی کوری مالك )ی فەرموو، کە یەکیك‌بوو لە ئەصحابە پایەبەرزەکانو زور خوشەویستو بەحورمەت بوو لای پیغەمەر ، وە ئەم‌ئاموژگاری‌یە بەشی زوری دەربارەی ئەوەیە کە ئینسان بەربەرەکانی نەفسی سەرکەش بکاو جلەوی توندبکاتەوەو رامی بکا بو بەجی‌هینانی فەرمانی خوا• هیوادارم بەدل گویی بوراگرن •

حەزرەت ، صلى الله عليه وسلم ، ئەفەرموی بە (أنس) : ئەی برام ! من وەصیەتت بو ئەکەم وەصیەتیکی بەسوود بەدل وەری‌بگرەو لای خوت رایگرە • رجام ئەوەیە ئەووەصیەتە ببی بە هوی ئەوە کە خوای گەورە قازانجت پی‌بگەیەنی • (یەکەم) : جارجار برو بو سەرقەبران بەروژا هەتا پاشەروژو مردنی خوت بیربکەویتەوەو بیتە پیش‌چاوت تویش وەکو ئەورەفیقانەت کە مردوون ئەمری‌و ئەم‌دلیایە

بەجی‌بیلیت ، بەلام زورزور مەرو نەبادا بەتەواوی دلت لەئیش‌و کاری
دنیات هەلبتەکینی‌و ژیانی خوت‌و خیزانت تال‌بکەی یاخو سامی قەبرو
مردنت لا نەمینی‌و دلت رەق‌و رەش بیتەوە • (دووەم) : مردوو
بشورە ، چونکە مەشغوول‌بوون‌و خوخەریك‌کردن بە شوردنی
لەشیکی کەوتووی بی‌گیانەوە ئاموژگاری‌یەکی زور بەرزی
بەسوودی تیایە بو یەکی کە خاوەن‌دل بی • (سیهەم) : نویژی جەنازە
بکە بەلکو دلت غەمبار ببی‌و مەحەبەتی خوای گەورەی تیا پەیدا بی ،
چونکە ئەوکەسەی لەترسی خوادا غەمگین‌بی لەسیبەری لوطفی خوادا
ئەبی‌و لەوانەیە تووشی هەموخیریك ببی • (چوارەم) : لەگەل فەقیرو
هەژارانا دانیشەو رابویرەو هەرکاتی گەیشتی پییان سەلامیان لی‌بکە
چونکە لەمەوە چەن‌سوودیکی باشت دەس‌ئەکەوی : دلی ئەوان
خوش ئەکەی‌و خوایش زور حەزئەکا لەوە ئینسان دلی داماوان خوش
بکا وە نەفست ئولفەت ئەگری پییانەوەو خووی ئەوان ئەگری‌و لە
یاخی‌بوون دوور ئەکەویتەوە • (پینجەم) : جارجار لەگەل ئینسانی
دەردەدارا خواردەمەنی بخو لەبەر تەوازوع‌و خوبەکەم‌گرتن لەبەر
رەزای‌خواو لەبەر ئیمان‌و باوەر بەخوا کە حەزئەکا لە خوبەکەم‌گرتن
بەرامبەر بە فەقیران • (شەشەم) : جارجار بەرگ‌و پوشاکی زبرو
کەم‌وکوور بپوشە هەتا فیزو دەمارو لەخوبایی‌بوون لە نەفستا کز
ببی‌و لەدلتا شوینی نەبیتەوە ، وە جارجاریش بەرگ‌و پوشاکی جوان
لەبەرکە لەکاتی عیبادەتی خوادا وەکو روژانی جومعەو جەژنەکان‌و
لەکاتی نویژی جەماعەت‌و کوبوونەوەی خەلکا بو یادی موناسەبەیەکی
دینی ، چونکە ئینسانی موسولمان ئەتوانی ئەم‌وەزعە بەسەرخویا بینی
لەبەر دەربرینی نیعمەتی خواو لەبەر حورمەت‌و قەدری ئیسلامی‌یەت•
وە هەرگیز گیان‌لەبەر بە ئاگر مەسووتینەو سزایان‌مەدە ، چونکە
سزادان بە ئاگر هەر بو خوا رەوایەو خوایش هەر لە قیامەتا
ئەونەوعە ئازارانە ئەدا •

براکانم ! ئەم‌چەن مادەیە ئاموژگاری حەزرەت بوون بو

ئەوصەحابی‌یە پاکە ، وە دیارە فەرموودەی حەزرەت بو ئەوەیە هەمووئادەمیزادیك سوودی لی وەرگری ، چونکە زورجار حەزرەت ئەمری فەرمووە بەوکەسانەی گوییان لە ئاموژگاری‌یەکانی بووە ئەوئاموژگاری‌یانە بگەیەنن بەوانەی کە لەویدا حازر نەبوون ، کەواتە ئەم‌جورە ئاموژگاری‌یانە بو هەمووکەسیکن •

بی‌گومان دینی ئیسلامی پیروز دینیکی فراوانی وایە کە بو دنیاو قیامەت بەکارەو سوودی لی وەرئەگیری • وە مەبەستی حەزرەت ، صلى الله عليه وسلم ، لەم‌ئاموژگاری‌یە ئەوەیە رەوا نی‌یە موسولمان هەمیشە نەفسی خوی لە مەزرەعەی ئارەزووی بەتالی خویا بلەوەرینی‌و هەرگیز ئاوری نەداتەوە بەلای رام‌کردنو جلەوتوندکردنەوەی نەفسی سەرکەشیا • وە هەروەکو دروستە ئینسان لە خواردەمەنی خوش بنوشی‌و لە پوشاکی جوان بپوشی‌و لە خانووی بەرزی رووناکا دانیشی‌و بو ناوگەل‌و شایی شەرعی‌دا سەربکیشی زور پیویستە جارجاریش‌،خوی ئازاربداو بە برسیەتی بیترسینی‌و بە خەریك‌بوونی لەشی مردووو چاوپی‌کەوتنی گوری خەلکی رابووردوو دای‌بچلەکینی‌و بە پوشینی پوشاکی تەنگ‌و زبرو کەم‌وکوور وەزعی داماوی داماوان بخاتەوە بیری هەتا بیری لە حالی ئەوان بکاتەوەو بو وەزعی پاشەروژی نادیاری خویشی ئاوری بداتەوە ، جا ئەگەر بەم‌وەزعەوە خووی‌گرت ئەوکاتە لەسەر خوشی سوپاسی خوای ئەکاو لەسەر ئازارو مەینەت خوی ئەگری‌و ئەتوانی توشەی روژی نەبراوەی ئەودنیاش ئامادەبکات •

× × ×

الحمدلله • ثم الحمدلله • الحمدلله الذى بعث الرسول الامين لتربية المسلمين ، ونفث في روح المؤمنين نفحات قدس الروح الامين ، احمده واشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له وان سيدنا محمدا عبده ورسوله للعالمين • اللهم صل على سيدنا محمد وعلى آله‌وصحبه

واتباعه المرتاضين بمبادىء الاسلام الى يوم الدين ، خصوصا علـــى سادة ديننا ذوى القد رالعلى و الفخر الجلى ابي بكر وعمر وعثمـــان وعلي ، وعلى الحسن والحسين وحمزة والعباس ، وعلى الستة الباقيـة من العشرة المبشرة رضى الله تعالى عنهم اجمعين .

أوصيكم ايها الناس ! ونفسى اولا بتقوى الله وطاعته فان اللـه مع الذين اتقوا والذينهم محسنون.ايها المؤمنون ! اتقوا الله واتعظوا بمواعظ الرسول المرشد الامين ، حيث قال مخاطبـا أنس بن مالك ، رضى الله عنه ، هاديا له وللمسلمين الى اقوم المسالك : اى اخى ! انى موصيك بوصية فاحفظها لعل الله ينفعك بها . زر القبور تذكر بهـــا الاخرة بالنهار احيانا ولاتكثر . واغسل الموتى فان معالجة جسد خاو عظة بليغة . وصل على الجنائز لعل ذلك يحزن قلبك فان الحزين فـى ظل الله تعالى معرض لكل خير . وجالس المساكين وسلم عليهـم اذا لقيتهم . وكل مع صاحب البلاء تواضعا لله وايمانا به . والبس الخشن الضيق من الثياب لعل العز والكبرياء لايكون لهما فيك مساغ .وتزين احيانا لعبادة ربك فان المؤمن كذلك يفعل تعففا وتكرما وتجملا . ولا تعذب شيئـا مما خلق الله بالنار .

هذه هى وصية معدن الكمال فاحفظوها واعملوا بها للسلوك فى مسلك الاعتدال لعلكم ترحمون ومن عذاب الله تسلمون . اعوذ بالله من الشيطان الرجيم . هذا ذكر وان للمتقين لحسن ماب جنات عـدن مفتحة لهم الابواب . نبهنى الله واياكم من نومة الغافلين وحشرنـى واياكم تحت لواء سيد المرسلين . آمين .

# خوتبەکانی مانگــی ذي الحجـــــة

## خوتبەی یەکــەم

**برا موسولمانەکانم !**

هەروەکو لەمـــەوپێـــش بەیانمـــانکـــرد رۆژوو عیبادەتێکـــی زۆرگەورەیەو حـــــەزرەت ، دروودی خوای لی بی ، زۆر رۆژووی گرتووە • وە پێویستە بزانن هەرچەن رۆژوو زۆر ئیحسانە بەلام لـــە رۆژە گەورەکانا خێری زۆرترە ، وە ئەورۆژانە بەعزێکیان لە هەموو سالێکا هەن وە بەعزێکیـــان لـــە هەموومانگیکاو بەعزێکیـــان لـــە هەموحەفتەیەکدا• جا ئەوانەی کە لە هەمووسالێکا هەن بریتین لـــە دە رۆژی ئەوەلی مانگی موحەرەم کە سەری سالی هیجری‌یە بەتایبەتی رۆژی دەهەمی ، وە نۆ رۆژی ئەوەلی مانگی قووربان (ذی‌الحجـــە) بەتایبـــەتی رۆژی عەرەفە کـــە رۆژی نوهـــەمی مانگی قوربانە ، وە شەش‌رۆژ لە مانگی (شوال) کە مانگی دوای مانگی رەمەزانە ، بەلکو هەموومانگە حەرامەکان کە مانگی موحـــەرەم‌و ذو القعـــدةو ذو الحجة (بیجگە چواررۆژەی جەژن‌و قوربانی کردن ) وە مانگی رەجـــــەب هەموویان رۆژوو زۆر خێرە تیایانا • وە حەزرەت ، صلی الله علیـــــە وسلم ، فەرموویەتی گەورەترین رۆژوو لە پاش رۆژووی رەمـــەزان رۆژووی مانگی موحەرەمە • وە فەرموویەتی : رۆژووی رۆژی لـــە چوارمانگەی حەرام ، کە موحەرەم‌و ذی‌القعدةو ذي الحجةو رەجەبن، خێری زۆرترە لە سی‌رۆژ لە مانگی‌تر،وە رۆژووی رۆژی لە رەمەزان خێری زۆرترە لە رۆژووی سیـــی رۆژ لە غەیری رەمەزان‌و خێـــری زۆرترە لە رۆژووی سیی رۆژ لەم‌مانگە حەرامانە • وە فەرموویەتی : هەرکەس مانگی رەمەزان بەرۆژوو بی وە شەش‌رۆژیش لە شـــوال بەشوێنیا بینی وەکو ئەوە وایە کە تەواوی سال بەرۆژوو بووبی •

وە ئەوروژووانە کە لە هەموومانگێکا تەکرار ئەبنەوە بریتین لە ڕوژووی ئەوەڵو ناوەراستو ئاخری هەموومانگێک ، وە ناوەراستی مانــگ بریتی‌یە لــە روژانی سیــانزەو چواردەو پانزەی مانگ کــە مەشهوورن بە (ایام‌البیض) یانی: ئەوروژانە کە شەوەکانیان بــەهوی مانگــەوە سپی‌و رووناکن ، وە ئاخری مانگیش بریتــی‌یە لە روژی بیستو هەشتو بیستونوو سی‌هەمی مانگ کــە مەشهوورن بــە (ایام‌الســود) یانی : ئەوروژانە کە شەوەکانیــان بەهوی بی‌مانگیەوە تاریکو رەش‌و بی‌نوورن • وە ئەوروژووانە کــە لە هەمووحەفتەیەکا تەکرار ئەبنەوە بریتین لە روژووی دووشەمەو پینج‌شەمەو جومعە •

وە سەبارەت بە دەروژی ئەوەلی مانگی قوربان ریوایەت کراوە لە عبداللەی کوری عباس ،خوایان لی رازی بی کە حەزرەت ، صلی اللە علیە وسلم ، فەرموویەتی : هیچ‌روژی نی‌یە کــە کردەوەی باش خیری زور بی بەقەد کردەوەی خیر لەم‌روژانە • یانی : دەی یەکەمی مانگی قوربان • ئەنجا ئەصحابەکان عەرزیان‌کرد : ئایا جیهادیش لــە ریگەی خوادا ئەوەندەی ئەوان خیــری نی‌یە ؟ حــەزرەت لە جوابا فەرمووی : جیهادیش ئەوەنەی ئەوروژانە خیری نی‌یە مەگەر کەســی کە بە نەفس‌و مالی خویەوە دەربچی بو جیهادو نە سەری بگەرینیتەوە نە مال ، ئەم‌فەرموودەیە بوخاری ریوایەتی کردووە • وە لە صەحیحی موسلیما ریوایەت کراوە لە ئەبوقەتادەوە خوای لی‌رازی بی : کــــە پرسیار کرا لە حەزرەت ، صلی اللە علیە وسلــم ، لە روژووی روژی (عەرەفە) فەرمووی : ئەبی بە کەفارەتی سالی لەوەپیش‌و ســالــــی لەوەپاش ، وە پرسیاری لی‌کرا لە روژووی روژی دەهەمی مانگــی موحەرەم فەرمووی: ئەبی بە کەفارەتی سالی پیشووی،وە فەرمووی: ئەگــەر بمینم بو سالی داهاتوو روژووی روژی نوهەمی موحــەرەم ئەگرم لەگەل روژی دەهەما • وە پیویستە بزانن کە روژووی روژی نوهەمی قوربان بو یەکی سوتنەتە کــــە لە حەجا نەبی‌و لە ئــەرزی عەرەفاتا نەبی ، چونکــە بو ئەوانە زەحمــەتە ئادابی حەج لەگــەل

رۆژووا بەجێبێن• وە هەروەها پێویستە لە ئەوەلی مانگی قوربانەوە تەحقیقی ئەوەلرۆژی مانگ بکەن هەتا بەراستی بزانن چ‌رۆژی ئەبێ بە رۆژی نوهـەم ئـەگینـا وەکو رۆژی (یوم‌الشـك) لە ئەوەلی رەمەزانەوە هەڵئەکەوی لە نوهەمی مانگی قوربانیشا هەڵئەکەوی وە لەوانەیە رۆژی نوهـەم رۆژی دەهەم بیو ببی بـە رۆژێ جـەژنو لەم‌کانەدا رورووگرتـی حـەرامە وەکو عالمـەکان فەرموویانە •وە سوننەتە بو ئەوکەسەی مەیلی لەسەر قوربانی‌کردنو حەیوان‌سەربرینە کە لە ئەوەلی مانگەوە هەتا کاتی سەربرینی قوربانی‌یەکە تەواو ئەبێ نینوك نەکاو سەر نەتاشیو بەرسمیل نەکا وەکو چون خاجی تا لـــە عەرەفات نەیەتە خوارەوەو طەواف نەکا سەر ناتاشی • ئەم‌ئادابانــە پێویستە ئینسانی موسولمان حالی‌ببی لییانو رەفتیاریان پی بکا •

× × ×

الحمدلله • ثم الحمدلله • الحمدلله الذى اراد الرحمة بالعبـاد فتفضل عليهم بالارشاد ، وارشدهم الى ادخار زاد السعادة ليوم اللقاء والمغاد • احمده واشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له وان سيدنا محمد عبده ورسوله سيد المرسلين الامجاد •اللهم صل علـى سيـدنا وشفيعنا محمد الهادى الى طريق الرشاد ، وعلى آله واصحابه واتباعه باحسان واستقامة الى يوم التناد ، خصوصا على سادة ديننا ذوي القدر العلى والفخر الجلى ابي بكر وعمر وعثمان وعلي ، وعلى الحســـن والحسين وحمزة والعباس ، وعلى الستة الباقية من العشرة المبشـرة رضي الله تعالى عنهم اجمعين •

اوصيكم ايها الناس ! ونفسى اولا بتقوى الله وطاعته فان اللـه مع الذين اتقوا والذين هم محسنون • ايها المؤمنون ! انكم تستقبلون شهرا مباركا اشتهر بمزيد الخير والاحسان وبتجليات الله سبحانـــه وتعالى على عبادد ، لاسيما على زمرة الحجاج الواقفين فى العرفات‌على قدم الجدلعبادة ربهم باعمال الحج والتلبية لاؤامرەوالاستغفار لذنوبهم

ولذنوب سائر العباد • فعليكم انتم الحاضرين فى منازلكم باتتهاز هذه الفرصة السعيدة السانحة بجلب الخير لكم ودفع وسخ المعاصى عنكم والابتهال الى ربكم والصيام فى هذه الايام المباركة لكفارة ذنوبكم • روي مسلم عن ابي قتادة ، رضى الله عنه ، انه قال :سئل رسول الله ، صلى الله عليهم وسلم ، عن صوم يوم عرفة فقال تكفر السنة الماضية والباقية • وروى البخارى عن ابن عباس ، رضى الله عنها ، قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم ، ما من أيام العمل فيها احب الى الله من هذه الايام يعنى ايام العشر ، قالوا : يارسول الله ! ولا الجهاد فى سبيل الله ! قال : ولا الجهاد فى سبيل الله الا رجل خرج بنفسه وماله فلم يرجع بشيىء من ذلك !• اعوذ بالله من الشيطان الرجيم ولقد جئناهم بكتاب فصلناهعلى هدى ورحمة لقوم يؤمنون • نبهنى الله واياكم من نومة الغافلين وحشرنى واياكم تحت لواء سيد المرسلين • آمين •

## خوتبەی دووەم بو مانگی ذي الحجة

**برا خوشەویستەکانم !**

خوای گەورە شەوو روژو مانگ‌و سالی دروست کردووە بەمشیوە ریك‌و پیك‌و جوانە کە لەبەرچاومانە، وە ئەموەختە بەنرخەی کردووە بە زنجیرەیەك کە هەربەشیکی تەرخان کراوە بو ئیشیك لە ئیشەکانی ژیانی دنیا ؛ یا بو عیبادەتیك لەوعیبادەتانە کە بەکاری قیامەت‌و دواروژی ئینسان دین • دیارە هەریەك لەمکاتانە هەلیکی تایبەتی‌یە کە رابوورد ناگەریتەوەو ئەوسوودە کە لەوکاتەدا دەس‌ئەکەوی لەدەس دەرئەچی ،کەواتە زور پیویستە ئینسان ئەوهەلانە لەکیس نەدا •

جا لەمرووەوە دەروژی ئەوەلی مانگی قوربان هەلی عیبادەتە ، وە نورروژی ئەوەلی هەلی روژووەو روژی دەهەمی هەتا سیانزە هەلی

قوربانی‌کردنە • وە قوربانی لە مەزهەبی ئیمامی شافعی‌دا سونەتە بو هەموو موسولمانیکی عاقلی بالغ کە زیاد لە مەصرەفی خوی‌و خیزانی بو چواررۆژەی جەژن بەشی کرینی حەیوانیکی هەبی کە بو قوربانی بشی • وە ئەگەر فەرزی کرد لەسەر خوی وەکو ئەوە بلیت : نەزر بی لەسەرم ،یا فەرز بی لەسەرم قوربانی بکەم یا فەرزبی لەسەرم ئەم‌حەیوانە بکەم بە قوربانی یا ئەم‌حەیوانە قوربانی‌یە ئەوە لەم‌حالانەدا واجب ئەبی لەسەری • وە حەیوانی قوربانی برتی‌یە لە وشتری کە پینج‌سالی تەواو کردبی‌و کەوتبیتە سالی شەشەمەوە ، یا گاو مانگاو بزنیکە دوو سالی تەواو کردبی‌و کەوتبیتە سالی سیهەمەوە ، یا مەریکە سالیکی تەواو کردبی‌و پی‌ی نابیتە سالی دووهەمەوە ، یاخو دانی کەوتبی ئەگەرچی شەش‌مانگەیش بیت • وە مەرو بزن بو تاقە ئینسانیك بەکار دین ، بەلام گاو مانگاو وشتر بو حەوت کەس بەکار دین ، هەروەکو دروستە چەن‌بەشیکیان قوربانی‌و چەن بەشیکیان حەوتم بیت • وە شەرتی حەیوانی قوربانی ئەوەیە کە عەیب‌دار نەبیت • یانی : پیویستە کویر نەبی ، یەك‌چاو نەبی ، گەرول نەبی ، لاوازیکی نابار یا نەخوشیکی خراپ نەبی ، شیت نەبی ، پارچەیەك لە ئەعزای نەبرابی وەکو دووگ یا گویچکە یا ران ، برین بە لەشیەوە نەبیت ، بالووکەی زوری پیوە نەبیت ، ئەوەندە دانەکانی نەکەوتبی یا نەشکابی کە زیان لە خواردن‌و لەوەرینی بدات ، بەلی • زەرەری نی‌یە ئەگەر دانی یا دوو یا سی یا چواری کەوتبی بە جوری کە باش شتی پی‌بخوری ، یا هەنگی یا دوو یا سی هەنگی پیوەبی • هەروەها زیانی نی‌یە کەمیك بشەلی ، یا گویچکەی قلەشابی یا کون بووبی ئەگەر گوشتەکەی دانەکەوتبی • وە لەسەر تەقلیدی بەعزی لە زانایانی دین دروستە حەیوانی ئاوس بکری بە قوربانی بەوشەرتەی کە بە ئاوسی‌یەکەی لاواز نەبووبی • هەروەها قەی‌ناکا ئەگەر لە ئەساسا گوانی نەبی یا شاخی نەبی یا گویچکەی کەری‌ی بی یا کلکی نەبی یا دووگی نەبی ، وە ئەم‌جورە حەیوانانە بو قوربانی ئەشین • وە

هەرقوربانی‌یەك سونـەت بی دروستـە خاوەن‌قوربانی‌یەکەو ژن‌و ئەولادو باوك‌و دایکی لە گوشتەکەی بخون ، وە ئەتوانن پیستەکەی هەلگرن بو خویان‌و ئەگـەر بیبەخشن خیـرترە . بەلام ئەگـەر قوربانی‌یەکە واجب بوو ئەوە دروست نی‌یە ئەمانەی کە وتمان لـی‌ی بخون یا پیستەکەی هەلگرن بو خویان ، بەلکو واجبە هەمووی بدەن بـە موسـتەحەق .

براکانم !دروست نی‌یە قوربانی‌کردن بو مردوو ئەگەر وەصیەتی نەکردبی کە قوربانی بو بکەن ، بەلام ئەگەر وەصیەتی کردبی ئـەوە واجبە لە مالی خوی بوی بکریت ، وە ئەگەر تەنها وەصیەتی کردبی‌و ئیتر مالی بەجی‌نەهیشتبی ئەوە دروستە کورەکەی یا کچەکەی لە مالی خویان قوربانی بو بکەن . وە ریگەی خیری قوربانی بو کەسـی وەصیەتی نەکردبی ئەوەیە ئەوکەسە کە قوربانی‌یەکە ئەکا بو خـوی بیکاو مردووکەش بکا بە شەریکی خیرەکەی وە ئەمە وەکو ئەوە وایە کە قوربانی بو ئەو کرابی . بەلی بەعزی لە عالمان فەرموویانـە : دروستە ئینسان قوربانی بکات بو هەرموسـولمانی کـە وەصیـەتی نەکردبی ، جا ئەوکەسەی کە ئەیەوی قوربانی بکات بو ئەوکەسانەی کە وەصیەتان نەکردووە بلیت : رازیم بە فەرموودەی ئەوئیمامانە کە ئەم‌جورە قوربانی‌یانەیان لا دروستە ئەوسا قوربانی سەربەخو بکـا بویان.وە هەر لەبەر ئەمەیە بەعزی لە موسولمانان‌و عالمان قوربانی‌یان کردووە بو حەزرەت ، صلی الله علیه وسلم ، وە بو ئەصحابـەکان‌و ئەولیاو پیاوچاکان‌و بو باوك‌و دایك‌و ژن‌و خزمی مردووی خـویان لەگەل ئەوەشدا کە وەصیەتیان نەکردووە .وە سونتەتە ئینسان خوی حەیوانی قوربانی‌یەکە سەربیری،وە لەکاتی سەربرینیا نی‌یەتی قوربانی لی بینی ، وە ئەگەر دای بە وەکیلی سەری ببری ئەبی لەوکاتەدا کـە حەیوانەکەی ئەداتی خوی نی‌یەتـی قوربانی لی بینـی یا بلـی بـە وەکیلەکەی لە کاتی سەربرینی حەیوانەکەدا ئەو نی‌یەتی قوربانی لـی بینی‌و سەری ببری ، هەروەها ئەگەر گایەك کرا بە قوربانی بو حـەوت

کەس پیویستە ئەویەکەیان کە سەری ئەبری یا وە کیلەکەیان نیەتـی قوربانی بینی بو ئەو حەوت‌کەسە هەموویان،وە ئەگەر چەن بەشیکی حەوتم بوو بە نیەتی ئەوبەشانە بو حەوتمو باقی‌یەکەی بو قوربانـی سەری ببری • خوا هەموولایەکمان تەوفیق‌بـدا بو کردەوەی چاكو پەیرەوی ئایینی پیروزی ئیســلام •

× × ×

الحمد لله • ثم الحمد لله • الحمد لله الذي تقبل الطاعة من المتقين، وزاد الاجر بقدر زيادة اخلاص المخلصين الصادقين • احمده واشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له وان سيدنا محمدا عبده ورسوله سيد المتقين • اللهم صل على سيدنا ومولانا محمد وعلى آله وصحبــه والتابعين له فى الاعمال المجاهدين بصدق ويقين ، خصوصا على سادة دیننا ذوى القدر العلى والفخر الجلى ابي بكر وعمر وعثمــان وعلي ، وعلى الحسن والحسين وحمزة والعباس ، وعلى الستة الباقية مـن العشرة المبشرة رضى الله تعالى عنهم اجمعين •

اوصيكم ايها الناس ! ونفسى اولا ، بتقوى الله وطاعته فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون • ايها المؤمنون ! اغتنموا هـذه الفرصة السعيدة بذبح الاضحية فانها فى الاخرة مطية • قال ، صلـى الله عليه وسلم ، عظموا ضحاياكم فانها مطاياكم او كمـا قال• وهـى سنة على الكفاية عند الشافعى ، رضى الله عنه • ويجزىء الابل والبقر عن سبع والضأن والمعز عن واحد • وشرطها فى الابل تمام خمـس سنوات والطعن فى السادسة ، وفى البقر والمعز تمام سنتين والدخول فى الثالثة ، وفى الضأن تمام سنة والدخول فى الثانية او سقوط السن فى الشهر السابع من عمره • ويجب ان تكون سليمة من العيوب المنفرة أو المنقصة للحم • ويجوز الاكل من لحوم الاضـاحي المنـدوبة دون الواجبة • وتجوز الاضحية للميت الذى وصى بها ، واما اذا لم يوص فلا يجوز ذبحها له استقلالا او تبعا وانما يجوز ذبحها بنية كونهـا اضحية للذابح مع اشراك ذلك الميت فى الثواب•نعم قال بعض العلماء:

يجوز ذبحها للموتى وان لم يوصوا ولا بأس بتقليد هؤلاء المجوزين • هذا هو ادب الاسلام تنبغى معرفته للمسلمين• اعوذ بالله من الشيطان الرجيم والذين جاءوا من بعدهم يقولون ربنا اغفر لنا ولاخواننا الذين سبقونا بالايمان ولا تجعل في قلوبنا غلا للذين آمنوا ربنا انك رؤوف رحيم • نبهنى الله واياكم من نومة الغافلين ، وحشرنى واياكم تحت لـــــواء سيد المرسلين • آمين •

× × ×

## الخطبة الاولى لعيدالاضحى المبـارك

الله اكبر (تسعا) • الله اكبر ماسار الحجاج الى بيته الحــــرام فبلغوا الميقات ودخلوا فى الاحرام ووصلوا مكة وطافوا بالبيت طواف القدوم ، وما استغفروا الله عن الذنوب والاثام • الله اكبر ماخرجــوا الى العرفات ووقفوا بها بعضا من ليلة تاسع الايام ، ثم افاضوا منهــا الى المشعر الحرام • الله اكبر ماطافوا بالبيت طواف الركن وسعوا بين الصفا والمروة بكل اخلاص واحترام • الله اكبر ما حلقوا أو قصــــــروا روءوسهم تحللا من المناسك وفوزا بالمرام •

الحمد لله الذي هدى المسلمين الى سعادة الدنيا والاخرة بارشــاد سيد الانام • احمده واشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له الواحد العلام ، وان سيدنا محمدا عبــده ورســـوله خاتم الرســل والانبيــاء الكرام • اللهم صل على سيدنا محمد وعلى آله واصحابه واتباعــــه المخلصين المقتدين بذلك الامام وسلم تسليما،خصوصا على سادة ديننا ذوى القدر العلى والفخر الجلى ابي بكر وعمر وعثمان وعلي وعلـــى الحسن والحسين وحمزة والعباس وعلى الستة الباقية من العشـــرة المبشرة رضى الله تعالى عنهم اجمعين •

اوصيكم ايها الناس ! ونفسى اولا ، بتقوى الله وطاعته فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون • ايها المسلمون ! يومكم هــذا

يوم عظيم ، يوم زيارة بيت الله الكريم ، يوم اطعام الناس بالاضاحى بغية الوصول الى خير الدنيا وسعادة جنة النعيم .واعلموا ان المسلمين بعد ان يصلوا صلاة عيدهم المبارك يرجعون الى منازلهم وينحر كل من عنده اضحية اسوة بسنة الرسول العظيم . واعلموا ان هذه السنة السنية الاسلامية جاءت من سيدنا ابراهيم فانه لما اوحى الله اليه فى المنام بذبح ولده اسماعيل استشاره وقال : ( يا بني اني أرى في المنام اني اذبحك فأنظر ماذا ترى ) فأجابه بكل احترام وتبجيل وتكريم ، وانقاد له بقلب سليم وقال : (ياابت افعل ماتؤمر ستجدنى ان شاءالله من الصابرين) . ولما اسلما لامر الله العليم الحكيم ، وتل ابراهيم ولده الكريم للجبين وامر السكين على رقبته الشريفة لم يقطع شيئا منها وقاية من الله الرؤوف الرحيم وناداه ان يا ابراهيم قد صدقت الرؤيا ، وفداه بذبح عظيم ، فذبح كبش الفداء وشكر مولاه على هذه النعمة العظمى حيث ابتلاه هذا الابتلاء الجسيم ووفقه لامتثال امر مولاه وجعل ولده بحيث ينقاد لما اوحاه فباشر بتلبية مارآه ونجاه بهذا الفداء المبارك وكرمه غاية التكريم فصارت سنة الضحية طريقة معتادة بين المسلمين . فيا أيها المؤمنون ! اخلصوا لله واذبحوا ضحاياكم ابتغاء عفوه ورضاه واطعموا منها الفقراء والمساكين مساعدة لهم ولاولادهم بهذه الضيافة ضيافة الله ، وعظموها فان الله جميل يحب الجمال وانتم من الذين عليهم انعم الله ، واتقوا ربكم بالقلوب . اعوذ بالله من الشيطان الرجيم يوم لاينفع مال ولا بنون الا من اتى الله بقلب سليم ذلك ومن يعظم شعائر الله فانها من تقوى القلوب نبهنى الله واياكم من نومة الغافلين ،وحشرنى واياكم تحت لواء سيد المرسلين . بارك الله لنا ولكم ولسائر المسلمين آمين .

## الخطبة الثانية

الله اكبر (سبعا) . الله اكبر مادى المسلمون شعائر الحج والعمرة لله رب العالمين . الله اكبر ماطافوا طواف الوداع من بيت

الله العلى المبين . الله اكبر ماتوجهوا الى زيارة قبر سيد الانام وشفيع المذنبين محمد خاتم الانبياء والمرسلين . الله اكبر ماوصلوا المدينة المنورة ورأوا القبة المطهرة فصلوا على ساكنها افضل الصلوة والتسليم. الله اكبر ماغسل الزائرون اجسامهم قبل دخول المدينة النبوية ودخلوا الجامع المبارك وصلوا به ركعتين ، وتوجهوا الى روضة سيد الانام واستقبلوها بالصلاة والسلام ، وطلبوا من الله مغفرة ذنوبهم وذنوب المسلمين فى اقطار الاسلام . الحمدلله . ثم الحمدلله . الحمدلله الذى كرم بنى ادم ، وانعم عليهم بارسال الرسل وهدايتهم الى طريق الرشاد. احمده واشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له ، وان سيدنا محمدا عبده ورسوله ، اللهم صل على سيدنا ومولانا محمد وعلى آله وصحبه واتباعه صلوة تقودنا الى النعيم المقيم وسلم تسليما .

اوصيكم ايها الناس ! ونفسى اولا ، بتقوى الله وطاعته فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون . ايها المؤمنون ! بادروا بالخيرات فى عهد الحياة فان الدنيا مزرعة الاخرة وسيلة لنيل الدرجات ، وصلوا وسلموا على من ختمت به النبوات كما قال رب الارض والسموات ان الله وملائكته يصلون على النبي يا أيها الذين آمنوا صلوا عليه وسلموا تسليما . اللهم صل على سيدنا محمد المبعوث بالرحمة للعالمين القائل خير الناس انفعهم للناس ياايها الذين امنوا صلوا عليه وسلموا تسليما . اللهم اغفر للمؤمنين والمؤمنات والمسلمين والمسلمات الاحياء منهم والاموات . اللهم انصر من نصر الدين واخذل من خذل المسلمين . اللهم اصلح ذات بيننا والف بين قلوبنا واجمع شملنا وتقبل عملنا يا ارحم الراحمين . اللهم اهد روءساءنا والهمهم الرشد والصواب ووفقهم للعمل واصلاح البلاد ، وايد جيشنا وسائر جيوش المسلمين . وبارك لنا في يومنا هذا وسائر أيامنا الى يوم الدين .

# خوتبەی سیهەم بومانگی ذي الحجـة

**برا خوشەویستەکانم !**

روژی لەروژان حەزرەت ، صلی الله علیه وسلم ، خوتبەیەکـی زور بەنرخی خویندەوە بەسەر هوزی قورەیشا، جا لەبەر ئەهەمی‌یەتی ئەوخوتبەیە وا ئەمرو بوتان ئەگیرمەوە •

حەزرەت ، صلی الله علیه وسلم ، ئەفەرمویت : ئەی‌خزمەکان ! یەکیك کە رەهنومای خیلی بی لە بیابانیکاو لە پیشـەوە بروا هـەتا هەوارگەیەك بدوزیتەوەو شوینیکی پر لەژیانو خوشی دیاری بکا بو خویانو مالاتیانو خویشی یەکیك بی لەوخاوەن مالاتانە ئەم‌ئینسانـە خاوەن‌هوشە ولات‌ناسە شارەزایـە هـەرگیـز درو ناکا لەگـەل خزمەکانیاو شارەزایان ناکا بو شوینیکی وشکی بی‌ئاو کـە لەبـەر بی‌گیایی‌و بی‌دەرامەتی خەلکەکەی تیا بمری‌و مالاتەکانیان قرر بکا ، چونکە خویشی یەکیکە لەوانو زیانی ئەوان زیانی ئەوەو فەوتانـی مالی ئەوان فەوتانی مالی ئەویشە • جا من بو ئیوە وەکو ئەورەهبەرە شارەزایە وام • والله ئەگەر درو بکەم لەگەل هەموو ئادەمیـزادا درو لەگەل ئیوە ناکەم، وە ئەگـەر هەموو ئادەمیـزاد دەستەشـکیـن‌و دەس‌خەرو بکەم هەرگیـز ئیوە دەس‌خـەرو ناکـەم کـەواتە ئەوئاموژگاری‌یانە کە بە ئیوەی ئەلیم بـەراستـی بـزانو بـەدل وەری‌بگرن •

قەسەم بەوخوایە کە غەیری ئەو کەسی‌تر خوا نی‌یە من بەراستی پیغەمبەری خوام بولای ئیوە بەتایبەتی‌و بـولای هەموو ئادەمیزاد بەگشتی • والله هەمووتان چون خەوتان لی‌ئەکەوی وەها ئەمـرن‌و گیاتتان دەرئەچی ، وە چون لەخەو خەبەرتان‌ئەبیتەوە وەها پاش‌مردن زیندوو ئەبنەوە •وە قەسەم بە خوا لەپاش زیندووبوونەوە حیسـابی کردەوەتان لەگەلا ئەکری‌و لـە پاداشی کردەوەی باشـاجەزای باش وەرئەگرن‌و لە پاداشی کردەوەی خراپا جەزای خراپ وەرئەگرن ، وە

جەزای موسولمان بەهەشتی بەردەوامو نەبراوەیەو جەزای کافــــر دوزەخو ئاگری بەردەوامو نەبراوەیە • ئەی خیلی قورەیش ! خوای گـــەورە بەهوی ناردنی منـــەوەو بەهوی نازلکردنی قورئانەوە فیزو دەماری زەمانی کوفرو نەفامیو نەزانی لـــە ئیوە حەرام کردووە ، وە رەوا نییە ئیتر وەکو ئەوسا بە باوکو باپیرەوە شانازیبکەنو خوتان بەزل بزانن ، چونکە هەموو ئادەمیزادی لە ئادەمەو ئادەمیش لە گــل دروســت کراوەو هەمووتان لـــە یەك ئەســلو یەك رەگو لە یەك نەتەوەنو هەمووتان لە ئەنجــاما ئەرونەوە ســەر خاكو یەك مایەتان هەیە • وە خوا ئەفەرمویت : ئەی ئادەمیزاد ! ئیوەمان دروســــت کردووە لە پیاوو ژنی ، لە ئادەمو حەوا ، وە لەپاشا ئیوەمان کرد بـــە چەن لقی گەورەو لە هەرلقی لەولقە گەورانە چەن لقی بچووکمــــان دروست کرد ،وە حیکمەتو غایە لە زورکردنتان ئەوەیە کە یەکتــــر بناسنو حەقی یەکتر بەجیبینن ، وە هەریەکی لە ئیوە وەکو ســەرو دلو دەستو پیو چاوو زمان خزمەتی لەشی کومەلەکەتان بکەن ، وە لەسەر ئەودەستوورە کە خوا ناردوویە بو پیغەمەران رەفتاربکەن ، وە رەهبەری ژیانتانو دەستووری سوودو زیانتــانو فەرمانرەوای ئاشووبو نیزاعتان ئەودەستوورەیە ، کەوابی لەســـەر ئەودەستوورە هەرکامتان باشتر رەفتار بکا بو دینو دنیا ئەوە لای خوا بە گەورەتر ئەناسری ، وە کامتان تەقواتان زیاتر بـــی لای خوا بـــەریزترە • وە ئەمتەقوایە بریتییە لە کردەوەی پەسەندی جوان ، وە بریتییە لـــە دلسوزیو میهرەبانی بو زەعیفو لاوازو لیقەوماوانو داماوان ، وە بریتییە لە ئاگادارییو هوشیــاری بو پاراستنــی موســـولمانان ، وە بریتییە لە تەمیو ئاموژگاری وەها کـــە سوودی تیابی بو دنیــاو بو پاشەروژی هەمووان،وە بریتییە لە خزمەتو ساغیو دلئەستووریو خوگرییو رەوشتــی بەرزی مەردانە ،وە بریتییە لـــە خو لادان لـــە رەوشتی زوشتی ناپەسەنو لە پەستی تەبیعەتو لە ئارەزووبازییو لـــە ئیشی چرووکی وەها کە ئەبن بەهوی نەخوشییو زیان • جا ئـــەگـــەر

ئینسـان ئەم‌تەقوایە بەم‌شیـوەیە وەرگـرت ئـەبی بـە خاوەنی هەمووخیریك‌و بە سەرفرازی‌و رووسووری ئالای سەعادەت‌و پیروزی دائەمەزرینی بە سەربانی بارەگای بەرزی‌یەوە ، وە بە وینـەی روژی تیشك‌دار بە ئاسمانی ئینسانی‌یەتەوە ئەدرەوشیتەوە .

هەروەها حەزرەت ، صلی الله علیـه وسلـم ، لە خوتبەکـەیا فەرمووی :رەحمەتی خوا لەوکەسە بی کە قسەی من ئەبیسی‌و لەپاشا ئەیگیریتەوە بەتەواوی‌و بەراستی بو ئەوانەی کە نەیان بیستـووە ، چونکە گەلی جار وا ئەبی ئەوکـەسە قسەکـەی بو ئـەگیریتەوە بەهوش‌ترو زاناترو زیرەك‌ترە لەوکەسەی کە قسەکە ئەگیریتەوەو لـە لایەنی ئەم‌ئینسانە زیرەکەوە قسەکە پەرەئەسینی‌و سوودی زوری لی وەرئـەگیـری .

وە فەرمووی :سی شت هەن لە دلی هەرموسولمانیکا بن ئەودلە داناخری یەکەم : دلسوزی‌و سـاغی لە کردارا لەبـەر رەزای خوا . دووەم : دلسـوزی‌و ساغی لەگەل ئەوکەسـانەدا کە بەراسـتی فەرمان‌رەوای گەلی موسولمانانن . سیهەم : تیکەلی لەگـەل کومەلی موسولمانانا بەنەوعی کە دلخوازی ئەوان بەشوینی ئەوموسولمانەوە بیت‌و ئەوان چی بلین ئەم بەجیی‌بینی .

وە فەرمووی:لادانی خەلك لە حەق زوربەی بەهوی ئارەزووی دنیاوەیە بوە ئەم‌ئینسـانەش لەم‌ئارەزووەدا بەخەتادا رویشتووە چونکە هەرکەس مەبەستی بەرزی پایەی قیامەت بی‌و کردەوەی لەسەر ئەمری خودا بی خوای گەورە ئیشـەکانی بو کو ئەکاتەوەو دەولەمـەندی‌و گوشادی ئەخاتە دلیەوەو دنیای بو رام ئەبی ، وە هەرکەس مەبەستی تەنهـا ئارەزووی دنیـا بی خوا ئیشـەکانی بلاو ئەکاتەوەو بەدەوام فەقیری‌و گەدایی‌و دلتەنگی ئەخاتە پیش‌چاوی‌و لەگەل ئـەوهەمووە هەول‌و تەقالایەش کە ئەیدا بو مالی دنیا هەر ئەوەندی پی ئەگا کـە خـوا بـوی داناوە .

× × ×

الحمدلله . ثم الحمدلله . الحمدلله الذى بعث رسوله الى الامم وارشدهم باياته وجوامع كلمه بالاحسان والكرم . احمده واشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له وان سيدنا محمدا عبده ورسوله الى العرب والعجم . اللهم صل على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه واتباعه المتبعين للطريق الاقوم ، خصوصا على سادة ديننا ذوى القدر العلى والفخر الجلى ابي بكر وعمر وعثمان وعلي ، وعلى الحسن والحسين وحمزة والعباس ، وعلى الستة الباقية من العشرة المبشرة رضى الله تعالى عنهم اجمعين .

اوصيكم ايها الناس ! ونفسى اولا بتقوى الله وطاعته فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون . ايها المسلمون ! اتقوا الله واسمعوا واطيعوا ماهديه اليكم من خطبة الرسول الاكرم حيث قال: ان الرائد لا يكذب اهله ، والله لو كذبت الناس جميعا ما كذبتكم ، ولو غررت الناس جميعا ماغررتكم . والله الذى لااله الا هو اني رسول الله اليكم خاصة والى الناس كافة . والله لتموتن كما تنامون ، ولتبعثن كما تستيقظون ، ولتحاسبن بما تعملون ، ولتجزون بالاحسان احسانا وبالسوء سوء ، وانها لجنة ابدا او لنار ابدا . يامعشر قريش ! ان الله قد اذهب عنكم نخوة الجاهلية وتعظمها بالاباء . الناس من ادم وادم من تراب . اعوذ بالله من الشيطان الرجيم ياايها الناس ! انا خلقناكم من ذكر وانثى وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا ان اكرمكم عند الله اتقاكم ان الله عليم خبير . نبهني الله واياكم من نومة الغافلين، وحشرني واياكم تحت لواء سيد المرسلين . آمين .

## خوتبەی چوارەم بو مانگی ذي الحجة

**برا خوشەویستەکانم !**

روژی حەزرەت ، صلی الله علیه وسلم ، خوتبەیەکی خویندەوە بو ئەصحابەکانی ئەمە مەعناکەیەتی کە بوتان بەیان ئەکەم :

فەرمووی : لەپاش سوپاس‌و ستایشی زاتی‌خوا بزانن : قورئان که کەلامی خوایە لە هەموو‌قسەیەك راست‌ترە، وە بەهێزترین‌شتی که دەستی پیوە بگیری ترسی خوایە ، وە باشترین‌دینی که ئینسان وەری‌بگری دینی حەزرەتی ئیبراهیمە کە بریتی‌یە لە تەوحیدو خوابەیەك‌زانین (وە دینی ئیسلام‌و دینی هەموو پیغەمەرەکان لەمەدا وەکویەکن) ،وە باشترین رەفتارو رەوشت رەفتارو رەوشتی محمدە، وە بەشەرەف‌ترین‌شتی که بەزمانا بیت ناوی خوایە ، وە باشترین قسەیە که بگیریتەوە قورئانە ، وە باشترین‌ئیشی ئیمە بیکەین ئەوانەن که لە دینی ئیسلاما بریاردراون بو کردن لە واجب‌و سوننەت ، وە خراپترین‌شت ئەوشتانەیە که خیلافی دین‌و بوون بە عادەت ، وە جوانترین هیدایەت‌و شارەزاکردن ئەوەیە لەسەر شیوەی فەرموودەی پیغەمەران بی ، وە گەورەترین مردن ئەوەیە که ئینسان بە شەهیدی بمری ، وە خراپ‌ترین کویری کویری دلە ، پەنابەخوا ، وە دەستی بەرز باشترە لە دەستی نزم ، ( یانی : ئەودەستەی شت ئەدا بە خەلك لەودەستە باشترە که شت وەرئەگری ) ، وە مالی که کەم بی‌و بەشی ئینسان بکا چاکترە لە مالیکی زوری وەها که ئینسان غافل بکا لە حەق ، وە خراپترین‌عوزر عوزریکە کە ئینسان لە سەرەمەرگا بیهینیتەوە ، وە خراپترین‌پەشیمانی ئەوەیە که لە روژی قیامەتا بی ، وە هەندی کەسی وا هەن که تاق‌وتەرا نویژ ئەکەن‌و کەم جار ناوی خوا ئەبەن ، ئەم‌کەسانە وان لە زیانا ، وە گەورەترین‌گوناه گوناهی زمانی دروزنە ، وە باشترین دەولەمەندی دەولەمەندی دلەو چاکترین‌توشە توشەی تەقواو ترسی خوایە ، وە سەری هەموو‌حیکمەت‌و مەعریفەتی ترسانە لە خوا ، وە چاکترین‌شتی لە دلی ئینسانا بی یەقین‌و زانستی تەواوە دەربارەی هەرشتی کە پیویست‌بی ئینسان ئیمانی هەبی پی‌ی ، وە دوودلی‌و وەسواسە لەبابەت عەقیدەوە وەکو کوفر وایە یا هەرکوفرە ، وە لاواندنەوەو پیاهەلدانی مردوو لە رەوشتی زەمانی جاهیلی‌یەتەو پیویستە تەرك

بکریت • وه خیانەت لە مالی موسولمانانا ئەبی بــە کومەلەبەردیــكو ئەکری بە سووتەمەنی دوزەخ لە قیامەتاو ئەهلی خیــانەتی پی ســزا ئەدری • وە مالھەلگرتــنو زەکاتنەدانی ئەبیتــە هوی داخکردنی ئینسان لە جەهەنەما • وە شیعرخویندنەوە لە بالورەکانی شەیتانــەو ئینسان مەشغوول ئەکا • ( مەبەس لەمشیعرە ئەوەیە کە ئاموژگاوییەکی خیر یا مەدحو سەنای شتیکی باشی تیا نەبی ) •

هەروەها فەرمووی:شەرابخواردن مەرکەزی هەمووگوناحیکە، بیگومان ئەوفیتنەو زیانانە کە بەهوی خواردنی شەرابەوە تووشــی دینو مالو ساغیلەشو حورمەتو عەقلو شەرەفی ئینسان ئــەبن لە شتیترەوە پەیدا نابن ، وە ئەوکەسە کە خوویگرت بە خواردنەوەی شــەرابەوە وەزعی بــەجوری ئــەگــوری زور گرانە چاربکریو بگــەریتەوە ســەر باری راســت •

براکانم ! ئەمەبەعزیك بوو لەوخوتبەیە کە حەزرەت ، صلی الله علیه وسلم ، خویندیەوە بەسەر ئەصحابەکانیا • هیوادارم سوودی لی وەربــــــــــگرن •

× × ×

الحمد لله • ثم الحمد لله • الحمد لله الذي جعل الانسان معــــدنا للفضيلة ما دام متحليا بوجوه الاحسان • أحمده واشــهد ان لا اله الا الله وحده لاشريك له وان سيدنا محمدا عبده ورسوله الشاكر الذاكر بالقلب واللسان • اللهم صل على سيدنا محمد وعلى آله وصحبــــه واتباعه باحسان الى يوم الدين ، خصوصا على ســادة ديننا ذوي القدر العلى والفخر الجلى ابي بكر وعمر وعثمان وعلي ، وعلى الحســــــن والحسين وحمزة والعباس ، وعلى الستة الباقية من العشــرة المبشــرة رضــي الله تعالى عنهم اجمعين •

اوصيكم ايها الناس ! ونفسى أولا بتقوى الله وطاعته فان اللــه مع الذين اتقوا والذين هم محسنون • ايها المؤمنون ! خطب النبــى ،

صلى الله عليه وسلم ، يوما في اصحابه وقال : اما بعد فلن اصـــدق الحديث كتلب الله تعالى ، واوثق العرى كلمة التقوى ، وخير الملل ملة ابراهيم ، وخير السنن سنة محمد ، واشـرف الحـديث ذكر اللـه ، واحسن القصص هذا القرآن • وخير الامور عوازمها وشر الامـــور محدثاتها واحسن الهدى هدى الانبياء • واشرف الموت قتل الشهداء• واعمى العمى الضلالة بعد الهدى • وخير العلم مانفع • وخير الهـدى ماتبع ، وشر العمى عمى القلب • واليد العليا خير من اليد السفلى • وماقل وكفى خير من مما كثر والهى • وشر المعذرة حين يحضر الموت، وشر الندامة يوم القيامة•ومن الناس من لاياتى الصلاة الا دبرا ،ومنهم من لايذكر الناس الا هجرا • واعظم الخطايا اللسان الكذوب • وخير الغنى غنى النفس ، وخير الزاد التقوى ، وراس الحكمة مخافة اللـه• وخير ماوقر في القلب اليقين ، والارتياب كفر • والنياحة من عمـــل الجاهلية • والغلول من جثا جهنم • والكنز كي من النار والشعر مـن مزامير ابليس • والخمر جماع الاثم • ايها المؤمنون ! عليكم انتمشوا على منهاج هذا المقال القيم بالامتثال لمرغوباته والاجتناب عنمحذوراته لعلكم تفلحون • اعوذ بالله من الشيطان الرجيم ان الله يامر بالعـدل والاحسان وايتاء ذى القربى ، وينهى عن الفحشاء والمنكر والبغـي ، يعظـكم لعلكـــم تذكـــرون •

## خوتبەی پینجـەم بو مانگی ذي الحجة

**برا خوشەویستەکانم !**

ئەمرو باقیاتی ئەوخوتبەتانە بو بەیان ئەکەم کە حەزرەت ، صلی الله علیه وسلم ، خویندیەوە بەسەر ئەصحابەکانیاو لە جومعــــەی پیشوا هەندیکیم بەیان کـرد بوتان •

حەزرەت فەرمووی : ژن داوی شەیتانە •یانی : وەکو صەیاد بە داو ماسیو پەلەوەرو گیانلەبەر ئەگری شـەیتانیـش بەهوی ژنەوە ئینسان دیل ئەکاو رامی ئەکا بو خوی • ئەمفەرموودەیە زورشتی لی

وەرنەگیری چونکە ئەوی راستی‌بی بیساں بەھوی نولفەت‌گرتن بە ژنی نامـــەحرەمـــەوە گیرودەی گوناح‌و تاوان ئـــەبی ،وە بـــەھوی ئارەزووی ژن‌ھینـــانەوە دەس‌بەرداری عیلـــم‌و کاسبـــی بەســـوودو سەفەری حەج‌و غەزا ئەبی ، وە بەھوی خوودان بە ژنەوە لە ھەستان بو مزگەوت‌و جەماعەت ئەکەوی ، وە بەھوی بەجی‌ھینانی ئارەزووی ژنی خویەوە تووشی مالی حەرام‌و کەسبی نامەشرووع ئەبیـــت ، وە بەھوی ژنەوە گیرودەی خزمایەتی کومەلی ناپیاوی خراپ ئەبی ، وە بەھوی قسەو فیتنەیی‌کردنی ژنەوە تووشی ئازاردانی براو خوشـــك‌و دایك‌و باوك ئەبی ، وە بەھوی بەد رەوشتی ژنەوە دلی دراوســـــی ئیشینی ، وە ئەگەر چـــەن ژنیکی ھـــەبوو لەوانەیە بـــەھوی زورخوش‌ویستنی یەکیکیانەوە لە رەفتاری عەدالەت‌و حەق‌پەرستـــی بکەوی • وە گەلی شتی‌تر تووشـــی ئینســـان ئەبی لەریگای ژنەوە، کەوابی پیویستە ھەمیشە ئینســـان ئاگای لـــە خوی بی‌و تووشـــی ئەم‌جورە تاوانانە نەبـــی •

ھەروەھا فەرمووی : تەمەنی گـــەنجی لقیکـــە لە شـــیتی • وە خراپ‌ترین کەسب مالیکە کە بەسوود دەس‌کەوی ، وە خراپتریـــن خواردەمەنی مالی ھەتیوە • وە ئینسانی بەختیار کەسیکە بەھـــوی گیرودەبوونی غەیری خویەوە عیبرەت وەرگری‌و خوی لـــە خراپـــە بپاریزی • وە چارەرەشی ئینسان ھەرلەوکاتەوە کە وا لە سکی دایکیا لە عیلمی خوادا دیارەو ، خوا ئەزانی کە ئینسان کردەوەی چاکـــەو بەختیـــار ئەبی یا کردەوەی خراپەو چارەی رەشـــە • وە فەرمووی : ھەرکام لە ئیوە ئەگەریتەوە بو گوریکی تاریك کـــە مەســـافەکـــەی چوارگەزە ، جا کە ئینسان ئەنجامی ئەوە بی حەق نی‌یە ئەوەنـــدە تاوان بپیچی بە خویەوە • وە فەرمووی : ئەوەی کە چاکی‌و خراپـــی کردەوەی پی دەربکەوی ئاخرەکـــەیەتی ، ئەگەر ئەنجامی کردەوەی خراپ بوو ئەوا خراپە ، وە ئەگەر باش بوو ئەوا باشە ،وە ھەر لەبەر ئەمەیە ھەموو ھوشـــیاری ھەمیشە لە خوا ئەپاریتەوە کـــە عاقیبەت‌و

ئەنجامی خێر بێت . وە فەرمووی : خراپترینی ئەوکەسانە کە قسە ئەگێڕنەوە ئەوانەن کە درو ئەگێڕنەوە . وە فەرمووی هەرچی لەمەوپاش بێت نزیکە ، چونکە شەوو ڕوژ لە هاتوچو ناکەوونو ئەوەندە ئەزانی ڕوژو حەفتەو مانگو ساڵ نوی ئەبنەوە ، کەوابی نە خوشی بەردەوامەو نە ناخوشی وە ژیانیش بەردەوام نیە جا کە مادام ئینسان هەرئەمریو مردنی نزیکە ئەبی ئاگاداری ڕوژی حیسابی بی. وە فەرمووی جنێودان بە موسولمان فسقەو دەرچوونە لە عەدالەت، وە شەرکردنو کوشتاری موسولمان یا کوفرە ئەگەر بە حەلال بزانری یا پیشقەرەولی کوفرە ئەگەر بە حەرام بزانری ، چونکە شتی خراپی وای لی پەیدا ئەبی کە لە ئەنجاما ئینسان گیرودەی کوفر ئەکات ، پەنابەخوا . وە خواردنی گوشتی موسولمان ، یانی : غەیبەتکردنی ، گوناحەو موخالیفی ئەمری خوای گەورەیە . وە خواردنی مالی موسولمان حەرامە وەك خوینرشتنی . وە فەرمووی : کەسی سوین لەسەر خوا بخوات کە ئەبی ئەوشتە بکا یا نەیکا خوا ئەیخاتەوە بەدرودا ، چونکە خوای گەورە لە هەموو ئیشیکدا خاوەنئیختیارەو مەیلی خویەتی هەرچی بکا یا نەیکا . وە فەرمووی : هەرکەس لە گوناحو تاوانی ژێردەستەی خوی یا هەریەکی کە حەقیکی هەبی لەسەری ببووری خوای گەورەش لە تاوانی ئەو ئەبووری ،وە هەرکەس ڕقی لە یەکی هەلساو ڕقەکەی خواردەوە خوا جەزای خیری ئەداتەوە . وە هەرکەسی صەبربکاو خوی بگری لەسەر بەلاو مەینەتی نەفسو مالو حورمەتو ناشوکری نەکا خوای گەورە جەزای باشی ئەداتەوە. وە فەرمووی :هەرکەس بو شورەتو ناوی ناوخەلك ئیش بکا خوای گەورە بیجگە لەوە کە کردەوەکەی قوبوول ناکا بە وەزعی ناباریش باسی ئەخاتە گویی خەلکەوە . وە هەرکەس بیفەرمانی خوا بکا خوای گەورە سزاو ئازاری ئەدات .

ئەنجا پاش ئەمفەرموودانە پاڕایەوەو فەرمووی : خوایا : تاوانی خومو ئوممەتەکەم بپوشە ، خوایا تاوانی خومو ئوممەتەکەم بپوشە .

داوای عەفوو لێبووردن ئەکەم بۆ خۆمو بۆ ئێوەش •

هیوادارم لەمفەرمووده بەنرخانە سوود وەربگرنو بیانکەن بە مەشخەلی ڕێگای دینو دنیاتان هەتا لە دنیادا سەربەرزو لە ڕۆژی دوایدا بە ڕەزامەندی خوا شاد بن •

× × ×

الحمد لله • ثم الحمد لله • الحمد لله الذي بعث رسوله لتأديب العاقلين وارشاد الغافلين • احمده واشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له وان سيدنا محمدا عبده ورسوله سيد المرسلين • اللهم صل وسلم على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه واتباعه اجمعين ، خصوصا على سادة ديننا ذوى القدر العلى والفخر الجلى ابي بكر وعمر وعثمان وعلي ، وعلى الحسن والحسين وحمزة والعباس وعلى الستة الباقية من العشرة المبشرة • رضى الله تعالى عنهم اجمعين •

اوصيكم ايها الناس ! ونفسى اولا بتقوى الله وطاعته فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون • ايها المؤمنون !اتقوا الله واتعظوا بما قاله الرسول الامين حيث قال من جملة ماقاله فى احدى خطبه العصماء : والنساء حبالة الشيطان • والشباب شعبة من الجنون• وشر المكاسب كسب الربا • وشر الماكل مال اليتيم • والسعيد من وعظ بغيره ، والشقى من شقى فى بطن امه • وانما يصير احدكم فى موضع اربعة اذرع • وملاك العمل خواتمه • وشر الروايا روايا الكذب • وكل ماهو آت قريب • وسباب المؤمن فسوق ، وقتال المؤمن كفر ، واكل لحمه من معصية الله ، وحرمة ماله كحرمة دمه • ومن يتألى على الله يكذبه • ومن يغفر يغفر الله له • ومن يكظم الغيظ ياجره الله • ومن يصبر على الرزية يعوضه الله • ومن يتبع السمعة يسمع الله به • ومن يصبر يضعف الله له ، ومن يعص الله يعذبه • اللهم اغفر لى ولامتى ، اللهم اغفر لى ولامتى ، اللهم اغفر لى ولامتى ، استغفر الله لى ولكم • اعوذ بالله من الشيطان الرجيم •ياايها الناس

قد جاءتكم موعظة من ربكم وشفاء لما في الصدور وهدى ورحمة لقوم يؤمنون • نبهني الله واياكم من نومة الغافلين ، وحشرني واياكم تحت لواء سيـد المرسلين • آمين •

## نویژی بارانبارین لەگەل خوتبەکانیـــــــــا

ئەمنویژه دوو رکاته وەکو نویژی جـەژن • لـه رکاتی یەکەما لەپاش دوعای افتتاح ئەبی حەوت جار الله اکبر بووتری • وه له بەینیانا وەکو نویژی جەژن تەسبیحانەکان ئەخوینری وه له رکاتی دووەمـا لەپاش الله اکبری بەرزبوونەوه له رکاتی یەکەم پینج جار الله اکبـر ئەووتری • وه سونەته له رکانی یەکەما پاش ســـوورەتی فاتیحه سوورەتی (قاف) یا سوورەتی (اعلی) بخوینری به دەنگی بـەرز ، وه له رکاتی دووەما لەپاش سوورەتی فاتیحه ســوورەتی (اقتربـت) یا (غاشیه) یا (نوح) بخـوینری • وه لەپاش سەلامدانەوه ئیـمام دوو خوتبه بخوینی • له خوتبەی یەکەما لەپیشەوه نو جار وه له خوتبەی دووەما لەپیشەوه حەوتجار (استغفر الله) بکات •وه لـه خوتبـەی دووەما دوعا مەشهوورەکه بخوینی•وه لەپاش ئەوەلی خوتبەی دووەم ئیمام هەلچەرخیو رووبکاته قیبلـه تا هەندی دوعا ئەخوینـی بـه پەنامەکی ئەنجا رووبکاتەوه خەلکەکەو خوتبەکەی تەواوبکا •

× × ×

## الخطبه الاولى للاستســـقاء

استغفر الله (تسعا) استغفر الله الذى يقبل التوبة عـن عبـاده ويعفو عن السيئات ، الذي يكفر عن خطايا من تاب ويرفعهم درجـات • الحمدلله الذى يجيب المضطر اذا دعاه ويسمع عبده اذا ناداه •احمـده واشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له وان سيدنا محمدا عبـــده ورسوله الذي احبه واصطفاه • اللهم صل على سيدنا ومولانا محمد وعلى آله واصحابه واتباعه من كل من والاه ،خصوصا على سادة ديننا ذوى

القدر العلى والفخر الجلى ابي بكر وعمروعثمان وعلي وعلى الحسن والحسين وحمزة والعباس ، وعلى الستة الباقية من العشرة المبشرة رضى الله تعالى عنهم اجمعين .

اوصيكم ايها الناس ! ونفسي اولا ، بتقوى الله وطاعته فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون . أيها المؤمنون ! اتقوا الله وتوبوا اليه من المعاصى والذنوب لعله برحمته يكشف عنكم المصائب والكروب . وماصابكم من مصيبة فبما كسبت ايديكم ويعفو عن كثير . روي عن النبى ، صلى الله عليه وسلم انه قال : خمس بخمس: مانقض العهد قوم الا سلط الله عليهم عدوهم ، وماحكموا بغير ماانزل الله الا فشا فيهم الفقر ، وما فشا فيهم الفاحشة الا فشا فيهم الموت ! ولا طففوا الكيل الا منعوا النبات واخذوا بالسنين ،ولا منعوا الزكاة الا حبس عنهم المطر . فاياكم وحقا يؤخذ عنكم ولا يرفع لا بالحج ولا بالجهاد وهو حق الناس ، فردوا المظالم وادوا الحقوق وتوبوا الى اللهواستغفروه لعله يتوب عليكم ويعيدنعمه الوافرةاليكم. قال تعالى على لسان سيدنا نوح : فقلت استغفروا ربكم انه كان غفارا يرسل السماء عليكم مدرارا ويمددكم باموال وبنين ويجعل لكم جنات ويجعل لكم انهارا . فاتقوا الله عباد الله ! وتصدقوا على الضعفاء والمساكين لعلكم ترحمون . اعوذ بالله من الشيطان الرجيم . وهو الذى ينزل الغيث من بعدما قنطوا وينشر رحمته وهو الولى الحميد . نبهني الله واياكم من نومة الغافلين وحشرنى واياكم تحت لواء سيد المرسلين ، ورحمنا بفضله . آمين .

## الخطبة الثانية

استغفر الله العظيم (سبعا) الحمدلله قابل التوب ذى الطول . احمده واشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له وان سيدنا محمدا عبده ورسوله . اللهم صل على سيدنا محمد وعلى آله واصحابه واتباعه وسلم تسليما .

اوصيكم ايها الناس ! ونفسى اولا بتقوى الله وطاعته فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون • ايها المؤمنون ادعوا ربكم تضرعا وخيفة لعلكم ترحمون • امن يجيب المضطر اذا دعاه ويكشف السوء ويجعلكم خلفاء الارض قليلا ماتذكرون • اللهم اسقنا غيثا مغيثا هنيئا مريئا مريعا غدقا مجللا سحا طبقا دائما • اللهم اسقنا الغيث ولا تجعلنا من القانطين • اللهم انا نستغفرك انك كنت غفارا فارسل السماء علينا مدرارا • اللهم انك امرتنا بدعائك ووعدتنا اجابتك فقد دعوناك كما امرتنا فاجبنا كماوعدتنا •اللهم فامنن علينا بمغفرة ماقارفنا واجابتك فى سقيانا وسعة ارزاقنا ياارحم الراحمين

# نویژی مانگ‌گیران‌و روژگیران‌و
# خوتبه‌کانیان

ئه‌م‌نویژانه دوو رکاتن که سونه‌تن‌و سونه‌تیشه به جه‌ماعه‌ت بکرین • وه به سی جور به‌جی‌ئه‌هینرین • یه‌که‌م ، که له هه‌موویان باشتره ، ئه‌وه‌یه له هه‌ررکانیکا دوو جار فاتیحه بخوینری له‌گه‌ل سووره‌تیکی قورئانا ، وه له‌پاش فاتیحه‌و سووره‌ته‌که رکووعیك ببری•واته:ئه‌بی به چوار فاتیحه‌و چوار رکووع‌و چوار سوجده•دووه‌م ئه‌وه‌یه که له هه‌ررکاتیکا یه‌ك جار فاتیحه بخوینری به‌لام له‌گه‌ل دوو رکووع‌و دوو سوجده‌دا • سیهه‌م ئه‌وه‌یه وه‌کو سونه‌تی پیش نویژی به‌یانی بکریت • یانی :له هه‌ررکاتیکا یه‌ك جار فاتیحه بخوینری‌و یه‌ك رکووع‌و دوو سوجده ببری ، وه ئه‌مه‌یان له هه‌موویان ئاسانتره • وه ئه‌وه‌ش بزانن که نویژی روژگیران به په‌نامه‌کی‌و نویژی مانگ‌گیران به ئاشکرا ئه‌کری ، یانی : نویژی روژگیران به ده‌نگی نزم‌و نویژی مانگ‌گیران به ده‌نگی به‌رز ئه‌کریت•

× × ×

## الخطبة الاولى للكسوف او الخسوف

الحمدلله • ثم الحمدلله • الحمدلله الذى جعل الشمس ضياء والقمر نورا وقدرهما منازل لتعبدوا ربكم وتاخذوا اجرا موفورا • احمده واشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له وان سيدنا محمدا عبده ورسوله المبعوث رحمة ونعمة ونورا • اللهم صل على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه واتباعه الذين اخلصوا دينهم لله فزادوا ايمانا وفرحا وسرورا ، خصوصا على سادة ديننا ذوى القدر العلى والفخر الجلى ابي بكر وعمر وعثمان وعلي ، وعلى الحسن والحسين وحمزة والعباس ، وعلى الستة الباقية من العشرة المبشرة رضى الله تعالى عنهم اجمعين •

اوصيكم ايها الناس ! ونفسي اولا ، بتقوى الله وطاعته فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون . ايها المؤمنون ! ان الشمس والقمر آيتان من آيات الله ودليلان على قدرته الباهرة فهما مع كبر الحجم وعظم الجرم يبقيان فى فلكهما بالانتظام على الدوام ، ويكونان وسيلتين لاستفادة الانام بضياء العالم وتنويره وبالتاثير فى المعادن والحيوانات والنبات فى نشوئه ونموه وتقديره على مر الايام والاعوام . وانهما لا ينكسفان لموت احد ولا ينجليان لحياته بل أن كسوف الشمس وخسوف القمر يجريان على نظام سنة الله فى الكائنات ولما يجرى عليهما في مقابلة جرم الارض او كواكب السموات ، ولكن في اخفاء نورهما تنبيها للغافلين وايقاظا للجاهلين حيث ينتبهون الى ان الانسان بل الحيوان كله يبقى في حالة محوهما في الظلمات ويشقى بدوام انجلاءهما فى كرب الحرارة او اضطراب فى الحياة او تعب لاختلال الراحة والسبات .

قال الله تعالى : وجعلنا الليل والنهار آيتين فمحونا آية الليل وجعلنا اية النهار مبصرة لتبتغوا فضلا من ربكم ولتعلموا عدد السنين والحساب وكل شيء فصلناه تفصيلا . وقال : وجعلنا نومكم سباتا وجعلنا الليل لباسا وجعلنا النهار معاشا . وقال : الم تر الى ربك كيف مد الظل ولو شاء لجعله ساكنا ثم جعلنا الشمس عليه دليلا ثم قبضناه الينا قبضا يسيرا . ففي كل ذلك دليل على جلاله وعظمته وكماله في رحمته ونعمته . فتوبوا اليه من المعاصي والذنوب واطلبوا كشف البلوى والكروب فانه هو الرئوف القريب والسميع المجيب . اعوذ بالله من الشيطان الرجيم . قل ارايتم ان جعل الله عليكم الليل سرمدا الى يوم القيامة من اله غير الله ياتيكم بضياء افلا تسمعون ؟ نبهني الله واياكم من نومة الغافلين ، وحشرني واياكم تحت لواء سيدالمرسلين

## الخطبة الثانية

الحمد لله . ثم الحمد لله . الحمد لله الذي بنى فوقكم سبعا شدادا وجعل فيها سراجا وهاجا . احمده واشهد ان لااله الا اللهوحده

لاشريك له وان سيدنا محمدا عبده ورسوله • اللهم صل على هـــذا الرسول الكريم المبعوث نورا وسراجا وعلى اله وصحبــه واتباعـــه وســـلم تسليمـــا •

اوصيكم ايها الناس ! ونفسى اولا ، بتقوى الله وطاعته فان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون • ايها المؤمنون ! اشكروا نعمــة الله واطلبوا رحمته فان الرحمة مع شكر النعمة والنقمة مع الكفر بهــا وفيه البلاء والزحمة • لئن شكرتم لازيدنكم وان كفرتــم ان عــذابى شديد • وعليكم برد المظالم وحقوق النــاس فانها توجب الخزي فى الاخرة وفى الدنيا بين الناس •ان فى الطاعة بضاعة وفــى العبـــادة سعادة • وان المغفرة لمن استغفر • قال تعالى : والذين اذا فعلوا فاحشة او ظلموا انفسهم ذكروا الله فاستغفروا لذنوبهم ، ومن يغفر الــذنوب الاالله ، ولم يصروا على مافعلوا وهم يعلمون اولئك جزائهم مغفرة من ربهم وجنات تجرى من تحتها الانهار خالدين فيها ونعم اجر العاملين • اللهم اغفر للمؤمنين والمؤمنات والمسلمين والمسلمات الاحيـــاء منهم والاموات • اللهم فرج عنا وعن المسلمين ، وثبتنا على اتباع سنـــة سيد المرسلين ، ولاتجعل فى قلوبنا غلا للذين آمنوا • ربنا انك سميع قريب تجيب دعوة الداعي اذا دعاك فاستجب دعاءنا برحمتك يا ارحم الـــراحمـــــين •

× × ×

**سوپاس بو خوای گەورە لیبوومەوە لە دانانی کتیبی ( وتاری ئایینی بو روژانی هەینی ) لە نیوەروی چوارشەممە ریکەوتی ١٨ ی مـــــانگی « شوال »ی سالی ١٣٨٠ ی هیجری بەرامبەری ٤ ی نیســـانی ١٩٦١ ی میلادی لە شاری بەغدا • لە خوای بەخشندەو میهرەبان ئەپاریمەوە کــە ئەم کردەوەم لی قوبوول بکاو بیکاتە هوی بەختیاریو سەربەرزی دنیـــاو قیامەتی موسولمانانی هاوزمانم •**

**ماموستای خویندنگای ئایینی شیخ عبدالقادری گەیلانیو**
**پیشنویژو خوتبەخوینی مزگەوتی ئەحمەدی لە بەغدا**
**عبدالکریم محمد**

# ناواخن

| لاپەرە | بابـــەت |
| --- | --- |

| بابــــەت | لاپەرە |
|---|---|

